# مێژوو



ژماره ٣
هاوینی ٢٠٠٧

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە
کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات





گۆڤاری

# مێژوو


گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە، کۆمەڵەی رۆشنبیری مێژوویی کوردستان دەریدەکات







ژمارە (٣) سالی یەکەم هاوینی ٢٠٠٧




**راوێژکاران**

**د. حەسەن جاف**

**د. جەوهەر سدیق شاوەیس**


- گۆڤار : مێژوو
- ژمارە : [ ٣ ]
- تیراژ : [ ٧٠٠ ] دانە
- چاپخانە : منارە



**کوردستان / هەولێر - گەڕەکی تەیراوە ، نزیك قوتابخانەی ئەیوبیەی سەرەتایی تێکەڵاو**

govari_meju@yahoo.com

govari_meju@maktoob.com

www.geocities.com\meju_govar

# پێرست

✓ **سەروتار** نووسینی مێژووی هاوچەرخی کورد شتێکی ئاسان نییە

✓ **وتار** لاپەڕە

✔ القسم العربي



✔ كەشكۆڵی گۆڤار

# نووسینی مێژووی هاوچەرخی کورد شتێکی ئاسان نییه

هەرچەندە بەشێوەیەکی گشتی نووسین و دەکیۆمێنتی مێژووی هاوچەرخ لە مێژووی کۆن و ناوەڕاست پترە، بەڵام هەندێ گرفت و ئاستەنگ دێنە بەردەم نووسینەوەی مێژووی هاوچەرخ کارەکە قورس دەکەن، لەوانە هەندێك لە مێژوونووسانی پێشووتر کە مێژوویان نووسیوە ئەوەندەی خەمی ئەوەیان بووە خەڵك رازی بکەن و مێژوو بە گوێرەی ئارەزووی زۆربەی خەڵکی بنووسن ئەوەندە خەمی ئەوەیان نەبووە راستییە مێژووییەکان بەدیاربخەن، هەندێ بابەت وەکو راستی بەڵگە نەویست خراونەتەڕوو لە کاتێکدا ئێستا پێویست بەوە دەکات بەسەر بەشێکی بەرچاو لە بابەتە گرنگەکانی مێژووی هاوچەرخمان بچینەوە و هەڵسەنگاندنی نوێیان بۆ بکەین، بەڵام گرفتەکە لەوەدایە بتوانی خەڵك بەو راستیانە ئاشنا بکەی کە ماوەیەکی زۆر لێیان شاردرابووەوە.

لە کاتێکدا کە پێویست دەکات مێژوونووسان ئەو پەڕی توانای خۆیان بۆ خزمەتکردنی نووسینی مێژووی کورد تەرخان بکەن و بوارەکە زۆر فراوانەو کۆششی هەمووانی پێویستە، هەست بەوە دەکرێ ناوی واهەبووە لەبواری مێژوونووسی کوردیدا، مێژووی کوردیان لە بەرژەوەندی ناو نازناوی خۆیان بەکارهێناوە واتە کارەکە پێچەوانەی ئەوەبووە کە دەبووا وابووایە، لەجیاتی ئەوەی مێژوونووس لە خزمەتی مێژووی کوردا بێ، مێژووی کورد کراوە بە ئامرازێك بۆ ناو ناوبانگی هەندێ کەس ئەم راستیە تاڵە لەوانەیە هەموو کەس هەستی پێ نەکات، بەڵام بەشێك لە مەترسیەکە لە هەست پێ نەکردنی زۆر لە نووسەرانیشە، هەروەها باس کردنی هەڵوێستی هەندێ لە کەسایەتییە

مێژووییەکانی تایبەت بە هەندێ بابەتی مێژووی کورد کارێکی زەحمەتە لەکاتێکدا ئەوانە زۆربەیان بنەماڵەو نەوەیان ماوە، جا ئەگەر هەڵوێستێکی خراپیان هەبووبێ یان لەبەر بنەماڵەو نەوەکانی باس نەکراوە یان پەردەپۆش کراوە، لەوانەیە لەکاتی باس کردنیشی تووشی گرفت ببی لەگەڵیان . لەهەمان کاتدا هەندێ کەسایەتی مێژوویی پتر لە قەبارەی خۆیان گەورەکراون و هەندێ کەسایەتی مێژوویی تر هەر باس نەکراون یان زۆر لە مافی خۆیان کەمتریان پێدراوە .

هەر لەم رووەوە ئەمڕۆ زۆر باس لە گەندەڵی دەکرێ، بێگومان گەندەڵی لە عێراق و کوردستان هەر ئەمڕۆ یان چەند ساڵێك نییە دروست بووە بەڵکو رەگ و ریشەی مێژوویی خۆی هەیە، تاکو ئەو رەگ و ریشە مێژوویانەش نەخرێتە روو بەشێوەیەکی باش لە فاکتەکانی ئێستا ناگەین، کەواتە گەندەڵیش مێژووی خۆی هەیە میراتێکە بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی بەشێکی بۆ فەرمانبەرەکانی دەوڵەتی عێراقی لە سەرەتای دامەزراندنی ئەو دەوڵەتە لە ساڵی ۱۹۲۱ شۆڕش و راپەڕینە کوردییەکانیش بەتایبەتی لە کوردستانی عێراق یەك لە داواکارییە دیارەکانیان نەهێشتنی گەندەڵی ئیداری حکومەتەکانی عێراق بووە، بەڵام لەناو دامودەزگای ئیداری دەوڵەتی عێراقدا کۆمەڵە فەرمانبەرێکی گەندەڵیش هەبوون، ئەگەر ئەمڕۆ ئەم بابەتە لە کتێبێك کۆبکرێتەوە کۆمەڵە راستییەکی مێژوویی دەخرێتە روو یارمەتی دەر دەبێ لەوەی پتر دژایەتی گەندەڵی لەسەردەمی ئێستادا بکرێ، بەڵام لەهەمان کاتدا لەوانەیە هەندێ لەنەوە کاربەدەستەکانی ئەو گەندەڵانەی جاران، توڕەبن ، ئەمەش کارێکی ئاسان نییە، بەڵام پێم وایە دەبێ بکرێ .

**سەرنووسەر**

# مێژوو بۆ هەموان

پ.د.ئەرسن موسا رەشید

کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان هەڵدەستێ بە کردنەوەی چەند کۆرسێك بۆ شارەزابوون لە مێژووی کورد بەخۆڕایی و ئەو کەسانەی بڕوانامەی پۆلی سێیەمی ناوەندی بەسەرەوەیان هەیە بۆیان دەبێ بەشداری لەم کۆڕسانە بکەن بەمەش ئەو کەسانەی پسپۆریشیان لە بواری مێژووی کورد نەبێ دەتوانن زانیارییە سەرەکییەکان سەبارەت بە مێژووی کورد پەیدا بکەن، چ قوتابی یان فەرمانبەر یان هەر پیشەیەکی تریان هەبێ بەم شێوەیەش کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان بەردەوام دەبێ لەسەر پەیڕەوکردنی بەرنامەکانی خۆی لە بڵاوکردنەوەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان لەناو هەموو چین و توێژەکانی کورد، بەشداریکردنی خەڵکیش لەم کۆڕسانە رادەی پەرۆشی تاکی کورد بۆ مێژووی نەتەوەکەی پیشان دەدا، ئێمە پێمان وایە کە ژمارەیەکی بەرچاو لە وەزارەتەکان و بەڕیوەبەرایەتیەکانیش ژمارەیەك کادیری خۆیان دەست نیشان بکەن بۆ بەشداریکردن لەم کۆرسانە مێژووی کورد بەتایبەتی کە رۆشنبیریی مێژوویی بەشێکی گرنگی رۆشنبیرییە بەشێوەیەکی گشتی، هیوادارین کە ئەم هەنگاوەی کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان هاندەربێ بۆ ئەوەی کۆمەڵەو سەندیکاکانی تریش کۆرسی زانیاری گشتی تایبەت بە پسپۆرییەکانیان بکەنەوە بۆ ئەوەی پتر ئاستی رۆشنبیریی کورد بەرزتربێتەوە،

بێگومانیان لەوەی کە خەڵك بەشێوەیەکی گشتی تینوی زانیارین بەتایبەتی ئەگەر لە سەردەستی پسپۆڕان و بەماوەیەکی کەم پێی بگات.

هەروەها دەمانەوێ بڵێین کە کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان مێژوونووسانی کوردستان لە کوردو کەمەنەتەوایەتییەکانی تری کوردستانیش بەخۆوە دەگرێ لە تورکمان و ئاسوری و هەروەها لە گۆڤاری مێژووش بایەخ بە بابەتی مێژووی کوردو کەمە نەتەوەکانی تری کوردستانیش دەدەین بێگومان کۆمەڵەکەشمان بە هاوکاری پتری هەموو لایەك بەبەردەوامی لە پێشکەوتندا دەبێ .

# له سەردەمی شەرەفخانی بەدلیسیەوە بۆ سەردەمی کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان

د. سەلام حەسەن خۆشناو

شەرەفخانی بەدلیسی لە سەدەی شازدەی زاینی ژیاوەو کتێبە بەنرخەکەی شەرەفنامەی لەو سەدەیەدا نووسیوە، جا هەرچەندە ئەمرۆ شەرەفخانی بەدلیسی تارادەیەکی باش لای کورد ناسراوە، نامەی دکتۆرا لەسەر کتێبەکەی نووسراوە، سەرچاوەیەکی گرنگی بەشێکی زۆری نووسینە مێژووییەکانە، شەرەفنامە وەرگێردراوەتە سەر چەندین زمانی ئەورووپی و رۆژهەلاتی و لەسەرەتای حەفتاکانیش وەرگێرانی کوردی هەژار موکریانی بۆ ئەم کتێبە بەچاپ گەیاندرا ئەمرۆ بەشێکی بەرچاو لە کتێبخانەکانی کوردستان چ کتێبخانەکانی حکومی یان کتێبخانە کەسییەکان کتێبی شەرەفنامەیان بە وەرگێرانە کوردی یان عەرەبییەکەی تیادایە تەنانەت قوتابی کورد لە کوردستانی عێراق هەر لە قۆناغی سەرەتاییەوە لە رێگای شیعرێکی ستایشەوە بۆ شەرەفخانی بەدلیسی هەر لە منداڵییەوە ناوی ئەو مێژوونووسە گەورەیەی کورد دەزانن، بەلاّم دیارە پایەی ئەم ناودارەی کورد وا دەخوازێت کە نەك هەر ئەوەندە بەڵکو پتری بۆ بکرێ، چونکە شەرەفخانی بەدلیسی قۆناغێکی نوێی لە نووسینی مێژووی کورد دەست پێکرد کە

نووسینی مێژووی کورد بوو بە شێوەیەکی گشتگیر لە کتێبێکدا .

لە سەدەی بیست و یەك کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دامەزرا، ماوەیەکی مێژوویی کە بریتیە لە چەندین سەدە لە نێوان سەردەمی شەرەفخانی بەدلیسی و سەردەمی کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان هەیە، بۆیە شتێکی ئاساییە کە ئەگەر هەر دوو لایان دڵسۆزی بۆ مێژوویی کوردو خزمەتکردنی ئامانجیان بێ ئەوا هەندێ جیاوازی لە نێوان شێوازی کارکردنی هەردوو لایەنەکە هەیە سەرەرای بوونی کۆمەڵێك چوونیەکیش لە هەمان بواردا ، چونکە شتێکی ئاساییە لەگەڵ گۆرانی سەردەمەکان شێوازی کارکردن و شێوازی نووسین گۆرانی بەسەردابێ، شەرەفخانی بەدلیسی بەزمانی فارسی کتێبەکەی نووسی بوو، بەڵام کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان پتر بە زمانی کوردی دەنووسێ چونکە پتر بۆ بڵاوکردنەوەی رۆشنبیریی مێژوویی لە ناوکورددا کاردەکات ئەگەر چ بە شێوەیەکی کەمتر گرنگی بە بڵاوکردنەوەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان بە زمانی جۆر بەجۆر لە دەرەوەی کوردستانیش دەدات. ئەمە رەخنە نییە لە شەرەفخانی بەدلیسی بگرین بەڵکو واقیعێکی مێژووییە کە دەرئەنجامی سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراوە.

شەرەفخانی بەدلیسی خۆی کتێبەکەی نووسیوەو بەناوی خۆی ناوی ناوە شەرەف نامە هەوڵی نەداوە میرێك یان کەسێکی تری کورد لە کارەکەیدا بەشداری بکات واتە بەشێوەی تاك کاری کردووە بەڵام کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان بە شێوەی کاری کۆمەڵەیی کار دەکات گۆڤارێك دەردەکات گۆڤاری مێژوو، کە دەیەها نووسەر تیایدا دەنووسن، کۆرو سیمنار

دەبەستێ بەدەیەها کەس بەشداری تیادا دەکەن قسەدەکەن رادەردەبڕن روونکردنەوەیان دەبێ رەخنەدەگرن بەڵام هەموویان سوود مەند دەبن، بێگومان کارێك کە چەندین کەس پێی هەڵبستن و نیازیان پاك بێ و لەگەڵ یەکتری کۆك بن باشتر دەبێ لە کاری تاکەکەس ئەمەش رەخنە نییە لەشەرەفخانی بەدلیسی بەڵکو دەبێ هەروابێ، ناکرێ لەسەردەمی شەرەفخانی بەدلیسیەوە تاکو ئێستا کە زۆربەی شتەکان گۆڕاون لە جل و بەرگ خواردن خانوو رێگاوبان هۆیەکانی هاتوچۆکردن و گواستنەوە جۆری قەڵەم و کاغەز نووسینی مێژوویی کوردی هەر وەکو خۆی بمێنێتەوەو بەرەو پێش نەچێ لەسەدەی شازدە کەمتر لە سەدایەکی خەڵکی کوردستان خوێندەوارنەبوون ئێستا هەرچەندە ئامارێکی رێك و پێکم سەبارەت بەڕادەی خوێندەواری لەبەردەستدا نییە بەڵام بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین رێژەی خوێندەواری باشە ئەمڕۆ لە هەموو زانکۆکانی کوردستانی عێراق بەشی مێژوو هەیە هەڵگرانی بڕوانامەی بکالۆریۆس لە مێژوو و بەسەرەوە بەسەدەهان لە کۆلێژی ئاداب زانکۆی سەلاحەددین بەشی مێژوو لقی مێژووی گشتی و مێژووی کوردی هەیە، ساڵانە چەندین قوتابی بڕوانامەی بەشی مێژووی کورد وەردەگرن ئەمانە هەمووی بوونەتە هۆی پێشکەوتن لە زمانی نووسینی مێژوویی و ئەوجیاوازیەی باسمان لێوەکرد.

# ئافرەتی کورد لە نێوان بەشداریکردن لە دروست کردنی مێژوو و نووسینەوەی مێژوودا

د. نیشتمان بەشیر محەمەد

کاتی ئەوە هاتووە بەسەر هەندێ لەو دروشمە سوواوانەدا بچینەوە کە ساڵانێکی زۆر لە نێوەندی رۆشنبیریی کورد دەوترانەوە دەنووسرانەوە سەبارەت بە مافی ئافرەت و رۆڵی ئافرەت لە کۆمەڵگای کوردیدا کەچی کەمتر رێگایەکی پراکتیکی دەست نیشان دەکرا بۆ چۆنیەتی کاراکردنی رۆڵی ئافرەت و پیشاندانی راستی ئەو رۆڵەی کە ئافرەت لە کۆمەڵگای کوردیدا هەیبووە و هەیەتی تاکو بەشێوەیەکی زانستیانەو راست و دروست و رۆڵی مێژوویی ئافرەتی کورد لە جڤانی کوردیدا بە لایەنە ئەرێ و نەرێیەکانی دەست نیشان نەکرێ، ناکرێ پلانێکی رێك بۆ ئەو بەشدارییەی کە چاوەڕوان دەکرێ ئافرەت لە پێشکەوتنی کوردیدا هەیبێ دەست نیشان بکرێ .

لە لایەك دەوترا و دەنووسرا کە ئافرەتی کورد چەوساوە بووەو کۆمەڵگای کوردی کۆمەڵگایەکی باوك سالاری بووە و لە لایەکی تر باس لەو ئازادییە دەکرا کە هەندێ لە رۆژهەڵاتناسان باسیان لێوەکردووە کە ئافرەتی کوردی لەئافرەتی دراوسێکانی لە فارس و تورك و عەرەب جیادەکردەوە. بەڵام لە

راستیدا ئەو وتەیەی رۆژهەڵاتناسان سەبارەت بە رادەی ئازادی ئافرەتی کورد بە بەراورد لەگەڵ ئەو دەوروبەرەی ئاماژەی پێکرا جۆرە زێدەڕۆییەکی پێوە دیاربووە، چونکە ئافرەتی دراوسێکانمان پێش ئافرەتانی کورد خوێندەوار بوونە و بوونەتە پزیشك و مامۆستا و ئەکتەر و نووسەر و سیاسی و ئەدیب و، لە هەمان کاتیشدا ئافرەتی کورد ئەوەندە چەوساوەش نەبووە و لەدەسەڵات بەدوور نەبووەو بەشداری لە دروست کردنی مێژوو و شارستانیەتی کوردیدا کردووە بەڵام وەکو پێویست پەنجە نەخراوەتە سەر ئەو بەشداریکردنە ئەگەر چی لە سەرچاوەکاندا ئاماژەیەکی کورت و بەچەند ناوێکی وەکو خانزادی میری سۆران و حەفسەخانی نەقیب و مەستورەی کوردستانی و قەدەم خێر دەکرێ، بەڵام ئافرەتي کورد ژمارەیان زۆر بووە ئەگەر هەمووشیان کارانەبووبن ئەوا بێگومان ژمارەی کارابووەکانیان زۆر لەم ناوانەو چەند ناوێکی تری ناو کتێبە کوردییەکانی تاکو ئێستا پتڕن .

هەموو سەرکردەیەکی کورد بەدرێژایی مێژوو کەوتووەتە ژێر کاریگەری ئافرەتی کورد جا ئەگەر دایکی، خوشکی، ژنی یان ژنەکانی ... تد بووبێ بەڵام ئایا نووسینە مێژووییەکان تاکو ئێستا چەند گرنگیان بەو بوارەداوە، لەو نووسینە مێژووییانە، لەسەر شێخ مەحمودی حەفید نووسراون ئەم بابەتە مافی خۆی دراوەتێ، ئایا کامە مێژوونووس نووسینێکی تایبەت کردووە بە رۆڵی ئافرەت لە ژیانی سمکۆی شکاك، ئایا چەند کورد دەزانێ ناوی ژنی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری چی بووە یەك ژنی هێناوە یان پتر و ئایا کاریگەری ئافرەت بەسەر شێخ عوبەیدوڵڵاو شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلا چی بووە، سەرکردە کوردەکانی تریش بەهەمان شێوە باس لە خۆیان دەکرێ

بەڵام باس کردنەکان پڕ کەم و کوڕین چونکە باس لە ڕۆڵی ئافرەت لە ژیانیان و کەسایەتی و بڕیارەکانیان نەکراوە، وەکو ئەوەی ئەم کارە شورەیی بێ نووسەرەکان شەرمی لێبکەن یان سەرکردەکانمان پێی لەکەداربن . ئەمە لە کاتێکدا توێژینەوە مێژووییە نوێیەکان لەکاتی باس کردنی هەر کەسایەتیەك گرنگی بەوە دەدەن لە چ چین و توێژێکی کۆمەڵایەتی بووەو چەندەمین منداڵ بووە لە خێزانەکەی کاریگەری دەوروبەری بەسەریەوە چۆن بووە، هەرگیز ڕۆڵی ئافرەتیش لە ژیانی کەسایەتییە گرنگەکان فەرامۆش ناکرێ.

ئەمڕۆ کە کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دروست بووە گرنگی دەدات بە نووسینەوەی مێژووی کورد بە شێوەیەکی زانستی لەم ڕووەوەش ڕۆڵی ئافرەتی کورد لە کۆمەڵگای کوردی بە درێژایی مێژووی کورد یەکێك لەو بابەتانەیە کاری لەسەر دەکات، ئەمەش لە چوارچێوەی بڕوابوونی کۆمەڵەکە بەڕۆڵی ئافرەت و توانای ئافرەتی کورد لە هەموو بوارەکاندا ئەم ڕاستیەش لە دەستەی کارگێڕی کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان و دەستەی نووسەرانی گۆڤاری مێژوو بەڕوونی دیارە کە ئافرەت بوونێکی کارای هەیە بۆیە خوازیاری ئەوەین لە کاتێکدا کە ئافرەتی کورد بەشداری گرنگی لە دروست کردنی مێژوو و شارستانیەتی کوردا هەبوو کە هەندێکی دیارەو لەسەری نووسراوە و هەندێکی تاکو ئێستا تیشکی نەخراوەتە سەر، ئەوە وا پێویست دەکات ئافرەتی کورد ڕۆلێکی پتری لە نووسینەوەی مێژووی کورد هەبێ کە ئێستا لە ڕۆڵی مێژوونووسە پیاوەکان زۆر کەمترە، بەڵام دەبێ بپرسین بۆچی لەسەدەی نۆزدە ئافرەتێکی وەکو مەستورەی کوردستانی بتوانێ مێژووی کورد بنووسێتەوە، کەچی لە سەدەی بیست و بیست و یەك

نووسینی مێژوونووسە ئافرەتەکان لە ئاستی خواستەکانی میللەتەکەمان دانەبێ، بۆیە ئێمە لێرەدا داواکارین ئافرەتە مێژوونووسەکانمان بەشداری چالاکانەتریان لە کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان و گۆڤاری مێژوودا هەبێ، تاکو جۆرە هاوسەنگیەك لە نێوان ئەو رۆڵە مەزنەی ئافرەتی کورد لە بەشداریکردن لە دروست کردنی مێژووی کوردا هەیەتی و ئەو رۆڵەی لە نووسینەوەی ئەو مێژووەدا هەیەتی دروست ببێ .

# مێژوونووس یا مێژووناس

د.حکیم احمد

زۆرجار ووشەی مێژوونووس و مێژووناسمان بەر گوێ دەکەوێت .. فلاَنی مێژوونووس، مێژوونووسی فلاَن، مێژوونووسان، مێژوونووسی .. هتد..

بەلاَم ئایا مێژوونووس کێیە ؟ ئەی مێژووناس کێیە ؟ ئاخۆ چ جیاوازییەك لەنێوان ئەم دووانە هەیە، یاخود هەردووکیان هاومانان ؟ لێرەدا هەوڵ دەدەین تیشك بخەینەسەر هەردوو زاراوەکە.

دیارە لە دانشگاو ئینستوتیایەکان، لەناوەخۆو دەرەوە چەندەها کۆلیج و بەش و لقی زانستی لەبوارە جیاجیاکاندا هەن، جا دەرچووی هەر بەشێك دوای ماوەیەکی خوێندنی دیاریکراو دەبێتە پسپۆری ئەم بوارەی تیایدا خوێندوویەتی بڕوانامەیەکی (باوەڕپێکراو) یشی پێدەدرێت کە پسپۆڕیەکەی دەسەلمێنێت.

بەشی مێژووش یەکێکە لەم بوارە زانستییانە کە پێگەیەکی گرنگی لە ریزی بەشە زانستیەکانی تردا هەیەو لەسەر ئاستی پڕۆگرامی خوێندنی زانکۆی جیهانی بایەخێکی بەرچاوی پێدەدرێت ئەوەش بە حوکمی زیندوویی بوارەکەو پەیوەندی پتەوی لەگەڵ زۆربەی زانستە مرۆییەکانی تر.

بۆ نموونە لە بەشەکانی مێژووی کۆلێژەکانی زانکۆکانی کوردستان بێگومان خوێندکار لەماوەی کۆرسەکانی خوێندنیدا لە بەشی مێژوو لە ماوەی چوار ساڵدا، چەندەها بابەتی مێژوویی وەردەگرێت کە هەمەچەشنە هەم لە رووی زەمینەوە هەم لە رووی (بابەت) یشەوە، کە جگە لە مێژووی سیاسی و

سەربازی، مێژوو و فەلسەفەی شارستانیش دەگرێتەوە وێڕای فێربوونی بنەماکانی میتۆدی توێژینەوە لە بواری مێژوودا..

لە رووی زەمەنیەوە ئەوەتا قوتابی مێژووی چاخەکۆنەکان و چاخەکانی ناوەڕاست و سەردەمی نوێ و هاوچەرخ دەخوێنێت، وە قۆناغ بە قۆناغ لە مێژووی نوێ و هاوچەرخ نزیك دەبێتەوە، چ لە مێژووی کورد بێت یاخود مێژووی دراوسێکانی کورد یا مێژووی ئەورووپاو ئەمریکا هەروەها ئاسیا و ئەفریقیاش .

بە دەربڕینێکی تر، مێژووی کۆن و نوێ، رۆژهەڵات و رۆژئاوا دەخوێندرێت، لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی گرنگیدانی زیاتر بە مێژووی نەتەوەکەمان کە بەهۆی پەراوێز خستنی یاخود فەرامۆشکردنی لەلایەن دەسەڵاتدارانی بیانی لە کوردستان هێشتا لە قۆناغی سەرەتاییە، کەواتە بەپێی لێکدانەوەی سروشتی لۆژیکی و نەتەوەیی و سیاسی پێویستە بایەخی زیاتر بە مێژووی شارستانی کورد بدرێت، بەدەر لە فەرامۆشکردنی
مێژووی نەتەوەکانی تر.

مەبەست لەم پێشەکیە ئەوەبوو کە دەرچووانی بەشی مێژوو تا رادەیەکی باش بەرچاویان روونە لەسەر مێژووی کۆن و نوێ ی نەتەوەکان بەگشتی و مێژووی کورد بەتایبەتی، هەر لەبەر ئەو زانیاریە مێژووییانەی لە بابەتە جیاجیاکانی چوارساڵی خوێندنی زانکۆدا دەستیانکەوتووە ئەم سەرچاوە مێژووییانەی ئاشنایان بوون، دەکرێت پێیان بڵێین (مێژووناس)، واتە (مێژووناس) ئەو کەسەیە کە پسپۆڕی بواری مێژووەو دەرچووی بەشی مێژووە. بێگومان لە ئاستی شیاوی و چالاکیشدا ئەو پسپۆڕانە هەموویان چونیەك نین هەروەك پسپۆڕانی هەر بوارێکی تر.

نابێت ئەوەش لەبیر بچێت کە کەسانێك هەن وەك خولیا و هیوایەت، حەز لەمێژوو دەکەن و بابەتە مێژووییەکان دەخوێننەوەو چیرۆك و بەسەرهاتی مێژوویی زۆریان لەبەرە بەڵام ناکرێت بەگشتی بەوانە بڵێین (مێژووناس) لەبەر ئەوەی لەسەر بنەمای ئەکادیمی و زانستی مێژوویان نەخوێندووەو بەگشتی (خوێندنەوە) و تێڕامانیان لە مێژوو کزو لاوازە و لایەنی سۆزو بۆچوونی تایبەتی خۆیی بەسەریدا زاڵە، بەڵام هەشیانە شارەزایە.

کەواتە دروست نییە بەهەر دەرچوویەکی بەشی مێژوو یان پسپۆرییەکی بواری مێژوو بگوترێت (مێژوونووس)، راستە هەموو مێژوونووسێك (مێژووناسە) بەڵام هەموو (مێژووناسێك) مێژوونووس نییە بەو پێودانگەی کە مێژوونووسی کارێکی وا ئاسان نییەو هەر کەسێك بابەتێك لەسەر مێژوو بنووسێت نابێتە مێژوونووس (پڕ بەمانای ووشەکە)، دیارە نووسینی مێژووش پەیوەستە بە چەند بنەماو رێوشوێنێك کە شارەزایان و پسپۆڕانی مێژوو و زانستە کۆمەڵایەتیەکان دیاریان کردووە، بەڵکو میتۆدی زانستی نووسینی مێژوو بۆتە بابەتێکی سەربەخۆ کە چەندەها نووسین و توێژینەوەی لەسەر کراوە، کاتێك کە دەیانخوێنیتەوە هەست بەسەختی ئەم کارەو گەورەیی بەرپرسیارێتیەکە دەکەی، دەبێت ئەوەشمان لەبەر چاو بێت کە نووسینی مێژوو بەرلەهەر شتێك بەرپرسیارەتیەکی رەوشتییە. هەروەها بەرپرسیارەتیەکی (مێژوویشە)، بە مانایەکی تر بەریزکردنی ووشەی یەك لەدوای یەك و گێڕانەوەو خستنەڕووی ماددەیەکی مێژوویی خاوەنەکەی نابێتە مێژوونووس تاوەکو هەوڵ نەدات مەرج و سیفەتەکانی مێژوونووس لەخۆی بینێتەدی کە مێژوونووس و شارەزایانی کۆن و نوێ جەختیان لەسەر کردۆتەوە، وەك هیرۆدۆتس و پولیبیوس و السخاوی و تریڤلیان و ..

وێڕای ئەم سیفەتانەش کە هەندێکیان سروشتی خۆڕسکن لە ناخی (تاکی) مێژوونووس، بەشێکی تریشیان زادەی هەوڵ و بزاڤی خودین، کاری مێژوونوسی وادەخوازێت کە بەردەوام (تاکی) مێژوونووس لە بیرکردنەوەو وردبوونەوەو تێڕامان بێت لەو ڕووداوانەی کە لە سەرچاوەکان دەیانخوێنێتەوە یاخود خۆی هاوچەرخیانە لە گەڵیاندا، تەنانەت ئەو ڕووداوانەی کە لە سەردەمە مێژووییە جیاوازەکانیشدا ڕوویانداوە پێویستە مێژوونووس هەوڵ بدات لە ڕێگەی گەڕانەوەی شعوری و تێڕامان لەگەڵیان بژییێت و (معایشە) یان بکات بێ ئەوەی هەست و نەستی و سۆزی تایبەتی خۆی لەگەڵ لێکدانەوە مێژووییەکان تێکەڵ بکات.

دەبێ ئەوەش بزانین کە مێژوونووسانی کۆن بەگشتی کۆکردنەوەو تۆمارکردنی ڕووداوەکانیان بەئەرکی یەکەم و سەرەکی خۆیان داناوەو کەمتر لە ڕاست و دروستی ڕووداوەکانیان کۆڵیوەتەوە، بەڵام ئەوە لە گرنگی و ڕۆڵی بەرهەمەکانیان کەم ناکاتەوە چونکە ئەوان بوار و کەرەسەی کەمتریان بۆ ڕەخساوە دابینبووە بۆ ئەم مەبەستە، لەبەر ئەوە تا ڕادەیەکی زۆر (عوزریان لەگەڵ خۆیان بووە).

بەڵام مێژوونووسانی ئەمڕۆ پێویستە ساغ کردنەوەی ڕووداوەکان و پێداچوونەوەی نووسینە مێژووییەکان بەئەرکی سەرەکی خۆیان بزانن نەك تەنها تۆمارکردن و کۆکردنەوە، چونکە سەردەم گۆڕاوەو کەرەسەو ئامرازو هۆکارە یاریدەدەرەکان لەبەرژەوەندی ڕەوڕەوەی زانستی مێژوون .

# پێشنیاری وەزارەتێك بۆ مێژوو و شوێنەوارو کەلەپووری نەتەوەیی

م. فارس قادر فەقێ عەبدوڵلا

هەرنەتەوەو وڵاتێك بە شتێك لە شتەکان دەوڵەمەندە، وڵات هەیە پیشەسازییە و نەتەوە هەیە بە کشتوکاڵ کردنەوە ناسراوە، نەتەوە یان وڵات هەن بەچاندنی بەرهەمێکی تایبەتی کشتوکاڵی ناسراون و زۆربەی سامانی نەتەوەیی ئەو نەتەوەیە یان وڵاتە پێك دەهێنن بۆ نموونە هەندێ وڵاتان لە جیهان هەن بە کۆمارەکانی مۆز ناسراون وڵاتانی خەلیج بە وڵاتانی پترۆلی ناودارن و لوبنان وڵاتێکە بەداری ئەرزناسراوە و بەسامانێکی نەتەوەیی لوبنانییەکان دادەنرێ و لەسەر ئاڵای وڵاتەکەش نەخشێندراوە. وڵات هەیە کشتوکاڵی و پیشەسازییە ..تد.

کوردستان ئەگەرچی وڵاتێکی کوشتوکاڵییە بەڵام ئەمرۆ کشتوکاڵ تیایدا دواکەوتووە ئەگەرچی وڵاتێکی پترۆلییە بەڵام هێشتا بەتەواوی سامانی پترۆڵی و کانزایی بەدەست خۆیەوە نییە و هەندێ کێشە لە نێوان دەسەڵاتی کوردی و دەسەڵاتی ناوەندی عێراق سەبارەت بەسامانە کانزایی و پترۆڵییەکان بەتەواوی یەکلایی نەکراونەتەوە بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین هێشتا کورد وەکو پێویست نەیتوانیوە سوود لەو سامانەی وەربگرێت.

کورد سامانێکی تری زۆر گرنگی هەیە ئەویش مێژوو و شوێنەوارو کەلەپووری نەتەوەییە بەڕادەیەك کە هەندێ دەوڵەتی زۆر بەهێزی جیهان لەوانەیە ئەمڕۆ بەپەرۆش بن نیو ئەوەندەی کورد لەم بوارانە دەوڵەمەندبووانەو لەم ڕووەوە هەست بەکەمی بکەن بۆ پڕکردنەوەی ئەم کەم و کوڕیەش پەناببەنە بەر مێژوو و شوێنەوار و کەلەپووری نەتەوەیی ولآتی جیهان بەجۆرێك لەجۆرەکان خۆیانی پێیەوە ببەستنەوە، بۆ نموونە لە ڕێگای پڕکردنی مۆزەخانەکانی ولآتانیان بە کەلوپەلی شوێنەواری ولآتانی تر یان هەندێك جار بە نیمچە گونجاندنێکی مێژوو لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیان، بەڵام کوردستان کە ژمارەیەکی یەکجار زۆر شوێنەواری هەیە و مێژوویەکی دەوڵەمەندیشی هەیە و کەلەپووری نەتەوەی کوردیش کە بەبەرامبەری ماددی ناخەملێندرێ وەکو پێویست گرنگی بەم سامانە نەتەوەییە گرنگەی خۆی نەداوە لەم ڕووەوە مێژوونووسانی کوردو دەسەلآتدارانی کورد بەرپرسیارن ئەمڕۆ لەهەولێر یەك مۆزەخانە هەیە ئەویش لەچاو شوێنەوارەکانی کوردستان زۆر هەژارە، جا بۆ لەهەموو قەزاو ناحیەکی کوردستان مۆزەخانەیەك نەبێ ؟ و مۆزەخانەی تایبەت بەلایەنێك لە لایەنەکانی شوێنەوارمان نەبێ وەکو مۆزەخانەی جەنگی، کە تەنیا چەك و پێویستیەکانی شەڕکردنی بەدرێژایی سەردەمە مێژووییە جۆر بەجۆرەکان تیادابێ لەگەڵ جل و بەرگی سەربازی سوپا کوردییەکان و، مۆزەخانەیەکی تایبەت بەدراوی کوردی و مۆزەخانەیەکی تایبەت بە پاشماوەی سەرکردە کوردەکان لە جل و بەرگ و وێنەو نامەو نووسراو بەگشتی و هەر شتێك کە تایبەت بەئەوان بێ و ..تد کە دەتوانین وەکو ولآتانی تر چەندین مۆزەخانە دروست بکەین .

بەڵام لەهەمان کاتیشدا با بپرسین کە ئایا ئەو مۆزەخانەیەی کە لە هەولێر یان سلێمانی یان دهۆك هەیە کە شوێنەوارەکانی کوردستانی عێراق تیایدا کۆکراوەتەوە چەند بووەتە بایەخی نووسەرو رۆشنبیرانی کورد چەند لەو نووسەرو رۆشنبیرانە سەردانیان کردووە لە نووسینەکانیان بە شیعرو چیرۆك رۆمان وتار رێپۆرتاژ یان فیلم بابەتیان لەسەر نووسیوە بە پیشاندانی گرنگی یان پیشاندانی کەم و کورییەکانی بۆ چارەسەرکردنی یان بۆ ئەوەی لە رێگای ئەوانەوە خەڵك زیاتر ئاشنای شوێنەوارو مێژوو نەتەوەکەی بێ.

ئایا چەند لە ئەندام پەرلەمان و وەزیرە بەرێزەکانی حکومەتی کوردستان و بەرێوەبەرەگشتییەکان و کاربەدەستەکانی دەوڵەت بەشێوەیەکی گشتی سەردانی مۆزەخانەکانی کوردستان دەکەن یان ئایا هەندێکیان هەر شوێنەکەی پێ دەزانن بێگومان هەموویان هەروەکو یەك نین بەڵام دیارە ئەگەر هەمووشیان بیان بینیایەو کەموکوریەکانیان زانیبوایە ئێستا دەبوو بارودۆخەکەی باشتر بووایە و قوتابیانی قۆناغە جۆربەجۆرەکانی خوێندن لە کوردستان چەند سەردانی ئەو مۆزەخانانە دەکەن ؟ ئایا بۆچی خەڵك بەشێوەیەکی گشتی لە کوردستان کەم سەردانی مۆزەخانە دەکەن لەکاتێکدا لە وڵاتانی تردا بەرامبەری ماددی دەدەن بۆ ئەوەی بچنە شوێنە شوێنەوارییەکان لەوانەش مۆزەخانەکان، پێم وانییە هەر هۆیەکە ئەوەبێ خەڵك بارودۆخی ئابووری زۆرباش نەبێ، چونکە خەڵك ئامادەن بەرامبەری ماددی بۆ زۆر شتی تر تەرخان بکات بەڵام خۆ لە کوردستان ئەو شتانە هێشتا بەرامبەری ماددی لێ وەرناگیرێ بەڵکو خەڵك بەخۆڕایی کەم سەردانی مۆزەخانەکان دەکات.

لەلایەكی تر گەورەترین كێشە لەلایەنی هاولاَتیان و بەرپرسانی ئەم بووارە لەماوەی رابردوو نەبوونی (بەدواداچوونەوە) بوو، هیچ لەهەردوولا خۆیان بەبەرپرس نەزانیوە لەلەناوچوون و فەوتاندنی شوێنەواری ئەم ولاَتە . بۆ نموونە لەگەلَ دروست بوونی رێگاوبانە نوێیەكان و شەقامەكانی ناوشار یان دروست بوونی خانوو تەلاری نویَ چ لەلایەن دەولَەت یان لەلایەن هاولاَتیان رێژەیەكی زۆری شوێنەوار لە كاتی كاركردن فەوتان و لەناوچوون یان بوون بەدەستكەوتێكی چەند بازرگانێكی بچووك و گەورە بۆ سوود وەرگرتنی كەسی كەوتنەبازارەكانی ناوەوەو دەرەوەی ولاَت و ئاودیوی سنووركران تا ئاستی ئەوەی دەنگۆی ئەوە هەبوو چەند جەنازەیەكی مۆمیاكراو لە ئەشكەوتەكان دۆزرانەوە و بە پالَپشتی بازرگانە گەورەكان ئاودیوی دەرەوەی سنوور كران.

لەلایەكی تر و لەسەر ئاستێكی نزمتر لەلایەن خەلَك لەبەر نەبوونی هۆشیاری نەتەوەیی لێرەو لەویَ ئەوەی دەدۆزرێتەوە بەتاك و كۆمەلَ لەلایەن ئەم گروپانە بەم كارە هەلَساون بۆخۆیان سودی لیَ وەردەگرن دەیفرۆشن . لەلایەكی تر زۆرجار خاوەن خانوو یان زەوی كە كەلوپەلی شوێنەواری تێدایە یان شك دەكریَ تێدا بیَ لەلایەن بەرێوەبەرایەتی شوێنەوار نەناسراوە. خاوەن خانو یان زەوی بزری دەكات یان ئامادە نیە دەولَەت ئاگادار بكاتەوە.

كەواتە ئەمانە هەر هەمووی دەگەرێتەوە بۆ نەبوونی هۆشیاریی نەتەوەیی لەگەلَ نەبوونی پاداشت و دەست خۆشی لیَ كردن لەلایەن دەولَەتەوە بۆ هاولاَتی.

كەواتە هۆشیاریی نەتەوەی و گرنگی كەلەپووری نەتەوەیی و شوێنەواری لەلای ئێمە لاوازە بۆیە ئێستا كاری كۆمەلَەی رۆشنبیریی مێژوویی كوردستان و

سەندیکای شوێنەوارناسانی کوردستان ئەوەیە بەگوێرەی توانای خۆیان گرنگی بەم لایەنە بدەن بەڵام لەوانەیە ئەرکەکە لەبەر گرنگییەکەی لە توانای ئەم کۆمەڵەیە و سەندیکایەشی نەبێ و لەبەر ئەوەی پێمان وایە ئەمەش رایەکی تایبەتی خۆمە هیوادارم کە بەهەڵە نەچوویم لەبەرئەوەی سامانی مێژوو و شوێنەوار و کەلەپووری نەتەوەیی ئەوەندە بەنرخە هیچی لە کشتوکاڵ و پترۆڵ و کارەبا و هەندێ بواری تر کەمتر نییە بۆیە لەوانەیە ئەگەر وەزارەتێك بۆ مێژوو و شوێنەوارو کەلەپووری نەتەوەیی دابندرێ کارێکی خراپ نەبێ بۆ ئەوەی هۆشیاریی نەتەوەیی و مێژووی گرنگی دان بە شوێنەوار لە کوردستان بڵاوبکرێتەوە، بڕواش بکەن هۆشیاریی نەتەوەیی بەبێ هۆشیاریی مێژوویی و هۆشیاریی شوێنەواری مانای نابێ و ناچەسپێ .

بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتانە بەباشی دەزانم ئەم پێشنیارانە بخەمە بەردەستی حکومەت و لایەنی بەرپرس لەم بوارە.

١- فراوان کردنی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوار تا ئاستی بوون بە وەزارەت هەروەك لە نووسینی بابەتەکەمدا ئاماژەم پێکردووە.

٢- دروست کردنی دەستەیەکی باڵا لەنێوان زانکۆکانی کوردستان و ئەم بەڕێوەبەرایەتیەو پێدانی دەسەڵاتی مادی و مەعنەوی بۆ رزگارکردن و پاراستنی ئەوەی ماوەو دەکرێ لەم شوێنەوارانە کە تاکو ئێستا لەلایەن دەوڵەت نەناسراون بەرەو فەوتان دەچن .

٣- کڕینەوەی ئەم مولك و زەویانەی کە لەکاتی کارکردن پاشماوەی شوێنەواری تێدا بەدیار دەکەوێ، بەنرخێکی زیاتر لەنرخی خۆی بۆ ئەوەی

هاولاتیان هان بدرێن هاوكاری دام و دەزگاكانی شوێنەوارناسی بكەن و لەهەمان كاتدا خۆشیان زەرەرمەند نەبن .

٤- دەرچوونی یاسایەك هەرچی بازرگانی بەكەل و پەل و پاشماوەی شوێنەواری بكات توندترین سزا بدرێت لەهەمان كاتدا تێكدانی شوێنەواریش سزای توندی لەسەر بێت .

# هۆکارەکانی دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردی لە سەدەی بیست ١٩١٨ – ١٩٧٥

کامەران عەزیز عەبدوڵلا

## بەشی یەکەم

### شوێنی جوگرافی کوردەکان

سەرەتا.. بەر لە دەست پێکی هۆکاری دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردی پێویستە ئاماژە بە شوێنی جوگرافی کوردەکان بکەین، چونکە بە بێ بوونی نشتیمان بوونی دەوڵەت مانا بەخش نابێ، هەروەها خۆی لە خۆیدا بوونی نیشتیمان خۆی یەکێکە لە بنەماکانی دروست بوونی دەوڵەت، کوردیش وەکو هەموو گەلانی خاوەن دەوڵەت خاك و نیشتیمانێکی هەیەلەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەتی نیە کە ئەویش لە ناوچەیەکی فراوانی باشووری رۆژئاوای ئاسیادا نیشتەخێ بوو کە بە کوردستان دەناسرێ.

وشەی کوردستان تەنها واتایەکی ئەتنۆگرافی دەگەیەنێ چونکە نە لە رابردوودا نە ئێستاش دەوڵەتێ بەناوی کوردستانەوە نەبووە و نیە. لەگەڵ ئەوەشدا کوردستان وەکو وڵاتێ بە درێژایی چەندین سەدە هەر لە ئارادا هەبووە[1]. زاراوەی کوردستان لە دوو برگە پێك هاتووە (کورد) لەگەڵ (ستان) کە خۆی زاراوەکە مانای وڵاتی کوردان دەبەخشێ[2]. بەڵام وشەی (کوردستان) وەك زاراوەیەکی جوگرافی واپێدەچێ کە بۆ یەکەم جار لە سەدەی

دوازدەهەمی زایینیدا لەسەردەمی سەلجوقیەکاندا پەیدا بوبێت[٣]. وە مێژوو نووسانی موسڵمان دواتر ئەم زاراوە جوگرافیایە یان بەکار هێناوە وە یەکەم جاریش لە کتێبی (نزهە القلوب) دا مستوفی قەزوینی لە ساڵی ١٣٤٠زدا نووسیویەتی کەوتۆتە بەرچاو[٤].

وە لازاریف دەڵێ کوردستان لە ناوەندی ناوچەی رۆژئاوای ئاسیا و نێوان هێڵەکانی ٣٤ و ٤٠ ی پانی و ٣٨ و ٤٨ ی درێژیدا هەڵکەوتووە کوردستان بەشی ناوەندی ئەو چوار گۆشەیە دەگرێتەوە کە لە باکور و باشووری رۆژئاواوە دەریاکانی رەش و ناوەراست و لە باکوور و باشووری رۆژهەلاتیشەوە دەریای قەزوینەوە کەنداوی فارس سنوورەکانی پێکدێنن کە درێژی کوردستان لە رۆژئاواوە بۆ رۆژهەلات نزیکەی ٤٠٠ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەیە[٥].

(لوسیان رامبۆ) لەو بروایەدایە کە کوردستان بڕبڕەی پشتی رۆژهەلاتی ناوەراست پێکدێنێت و دەڵێت (کوردستان بە تەواوەتی لە نێو دڵی ئاسیای بچووك هەڵکەوتووە و زۆربەی ئەو ناوچە شاخاویانە دەگرێتەوە کە کەوتونەتە نێوان دەریای رەش و دەشتەکانی میزوپۆتانیا لە لایەك و ئەنتی تۆرۆس و بانی ئێران لەلایەکی ترەوە)[٦].

ئەم ناوچەیە بە گوێرەی بیر و بۆچوون لە مانگ یان لە داس دەچێت وە ژمارەی دانیشتوانی بە قەد ژمارەی دانیشتوانی فەرەنسا دەبێوە دەچێتە ناو بەشێکی زۆر لە خاکی تورکیا و عێراق و ئێران لەگەڵ ئەوەشدا ئەو گەلەی کە لەسەر ئەم ناوچەیەدا دەژی بەناوی خۆیەوە ناو دەبردرێت بە شانازیەوە رەگەز و زمان و مێژووی خۆی جیایە لەگەڵ تورك و فارس و عەرەب دا[٧].

مینۆرسکی دەگاتە ئەو ڕایەی کە دەڵێ (واتای جوگرافی زاراوەی کوردستان هەرچیەك بێت لە ڕاستیدا بە واتا باوەکەی یانی ئەو خاکەی کوردی تێدا دەژی) [8].

بە شێوەیەکی گشتی مێژوو نووسان چەندین بیر و بۆچوونیان هەیە دەربارەی دیاری کردنی سنوری کوردستان. لە کتێبی (شەرەفنامە) کە میر شەرەفخانی بەتلیسی نووسیوویەتی ولاّتی کوردستان بەم شێوەیە دیاری دەکات کە دەڵێ: کوردستان لە کەنارەکانی زەریای هورمز-یان کەنداوی فارس نێزیکی زەریای هیند- ەوە دەست پێ دەکات و بەشێوەی هێڵێکی راست درێژ دەبێتەوە ناو ویلایەتی (مەلاتیە) [9] و (مەرعش) [10].

وە لەباکووری ئەم هێڵەوە درێژە دەکیشێ و ویلایەتی فارس و عێراقی عەجەم و ئەرمینیای بچووك و گەورە وە ویلایەتی ئەدرنە کیلیکیا و ئەریڤان دەگرێتەوە[11].

## تێروانینێك بۆ مێژووی گەلی کورد:

بۆ ئەوەی لە سروشتی مەسەلەی کورد تێبگەین دەبێ تەماشایەکی خێرای مێژووی کورد بکەین.

بەپێ ی زۆربەی سەرچاوەکان کورد لەسەدەی حەوتەمی پێش زایینی دا دەوڵەتی سەربەخۆی هەبووە ئەویش دەوڵەتی ((میدی)) بووە.

کە میدیەکان لە ناوچەی چیاکان نیشتەجێ بوون کە درێژ دەبێتەوە بۆ (کەنداوی فارس) تا نزیك دەریاچەی (وان) و بە درێژایی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس و کوردستان بەتەواوەتی[١٢] کە پایتەختەکەیان (اکبتانا) (هەمەدانی ئێستا) بوو کە پاشای میدی (کی اخسار) بە پێکهێنانی هاوپەیمانیتیەك لەگەڵ بابلیەکان توانی رووبەرووی ئیمپراتۆریەتی ئاشوری ببێتەوە وە لەساڵی ٦١٢پ.ز دەستی بەسەر پایتەختی ئاشوریەکان داگرت لە نەینەوا، دواتر لەساڵی٦١٠پ.ز توانی بەتەواوەتی بەسەر مەلیکی ئاشوریەکان (ئاشور- أوبالت) زاڵ بێت و کۆتایی بەم ئیمپراتۆریەتە گەورەیە بێنێ وە دەوڵەتی میدی لەسەردەمی (کی اخسار) بووە گەورەترین ئیمپراتۆریەت[١٣].

کە مێژووی دامەزراندنی دەوڵەتی میدیا هەتا ئێستا لە لایەن کوردەکانەوە بە دەستپێکی ساڵی کوردی دادەنرێت.

ئەم ئیمپراتۆریەتە کوردیە هەتا ساڵی (٥٥٠)ی پ.ز بەردەوام بوو لەم ساڵەدا (کوورەش)ی شای ئەخمینی توانی شانشینی میدیا بڕوخێنی[١٤].

بەم شێوەیە وڵاتی کورد کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەخمینییەوە. دوا بەدوای ئەمە وڵاتی کوردان بە هۆی شوێنگەی جوگرافیا و شوێنە ستراتیژیەکەی توشی جەنگی بەردەوام بووە لە نێوان دەوڵەتانی ململانیکەردا بە تایبەتی فارس و یۆنان و رۆمان و ئەرمەندا کەئەمەش بەگران لەسەری کەوتوە.

بەڵام کوردەکان جار بە جار دەیان توانی لە دەڤەرە کوردیەکاندا یان لە دەرەوەیان دا دەوڵەتۆکەی سەربەخۆ دابمەزرێنن هەروەها توانیان فەرمان رەوایی دەوڵەتۆکە گەلی ئیسلامی پانو پۆڕ بکەن[١٥].

کاتێ کە صلاح الدین لە ماوەیەکی زۆر کەمدا توانی دەسەلاتێکی باش بەدەست بێنێ و زۆر خۆی رەپێش خست و هەموو کاروباری میسری خستە ژێر دەسەلاتی خۆی[١٦]. دەوڵەتی ئەیوبی دامەزراند کە خاوەن دەسەلاتێکی فراوان بوو کە ولاتی میصر و ولاتی شام و ناوچەی جەزیرەی فوراتیە و یەمەنی دەگرتەوە هەرچەندە خۆی خەڵکی دوین بوو وە کوردێکی روادیە بەلام توانی دەسەلاتی فراوان لەم ناوچانە دامەزرێنێ[١٧].

دواتر لە کوردستان چەند میرنشینێك دەرکەوتن بە تایبەتی لە دوای شەڕی چارەنوسازی چالدێران لە سالی ١٥١٤دا کە ئیدریسی بەدلیسی توانی بەرێککەوتن لەگەل سولتان سەلیمی عوسمانی چەند میرنشینێکی کوردی لە کوردستان دابمەزرینێ.

ئەو میرنشینانە لەناو خۆیاندا کەم و زۆر سەربەخۆ بوون هەندێ لەو میرنشینانە دەسەلاتیان تا رادەیەکی باش فراوان بوو[١٨].

وە لە یەکێك لەو سەردەمانەش دا کوردەکان توانیان کۆنترۆلی حکومەتی نێوەندی ئێران بکەن ئەویش بە دەرکەوتنی کەریم خانی زەند لە سالی ١١٦٣ك دوای کوژرانی محمد حسن خان قاجار زۆربەی ناوچەکانی ئێرانی لەژێر دەست دابوو جگە لە خوراسان کە هەتاوەکو مردنیشی ئەم ناوچانەی لەژێر دەستی دا بوو[١٩].

وە لەلایەکی ترەوە میرنشینە کوردەکان هەر یەك لە ناوچەکانی خۆیان بەردەوام بوون لە فەرمان رەوایی بەلام لەسەدەی نۆزدەهەمدا دەوڵەتی عوسمانی سیاسەتی خۆی گۆری و کەوتە تێکدانی یەك لەدوای یەکی ئەو میرنشینانە[٢٠].

**بەشی دووەم:**

## ((هۆکارەکانی دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردی))

سەبارەت بە هۆکارەکانی دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردی لە سەدەی بیستەمدا و بەتایبەتی لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم وەکو زۆر دەوڵەتی نوێ لە دوای ئەم جەنگە لەسەر پاشماوەی دەوڵەتی عوسمانی هاتۆتە ئاراوە سەربەخۆیی خۆیان وەرگرتووە بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا کە کوردستان بەشێکی زۆری لە ژێر دەسەلاّتی عوسمانی بوو بەلاّم سەربەخۆیی خۆی وەرنەگرت بگرە لەوەش زیاتر پارچە پارچە کرا بەسەر دەوڵەتە نوێ یەکانی دەوروبەری ئەوەی جێ ی سەرنجە ئەوەیە کە ئەو دەوڵەتە نوێ یانە لەسەر بنەمای بەرژەوەندی ولاّتە زل هێزەکان وە بەنەخشە و پلانی ئەوان دامەزرا. دەکرێ هۆکاری دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردی بۆ دوو تەوەرەی سەرەکی بگەڕێندرێتەوە ئەوەش هۆکاری دەرەکی هۆکاری ناوخۆیی.

**یەکەم: هۆکاری دەرەکی**

**١- هۆکاری نێودەوڵەتی :**

سەبارەت بە سیاسەتی ولاّتە زل هێزەکان بەرامبەر بە کوردستان بە شێوەیەکی کرداری لە سالاّنی جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤–١٩١٨) دەرکەوت ئەم شەڕە سەرەرای ئەوەی کە یەکێکە لە رووداوە پڕ کارەسات و دڵتەزێنەکانی مێژووی مرۆڤایەتی، زۆر گۆڕانکاری سیاسی لەسەر ئاستی جیهان بە گشتی وە لە کوردستان بە تایبەتی دوای جەنگ هاتەکایەوە.

لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا پاش ئەوەی بەریتانیا و فەرەنسا زانیان کە ئەڵمانیا لە شەڕدا شکاوە، بۆیە لە کاروباری داهاتووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پەیمانێکی نهێنیان مۆر کرد، کە بە پەیمانی سایکس بیکۆ ناسراوە، کە بەپێ ی ئەو پەیمانە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بە دوو مەڵبەندی نفوزی بەریتانیا و فەرەنسا دابەش کرا[21].

بەم شێوەیە ئەو شوێنەی کە لەسەر نەخشە ڕەنگی سووری بۆ دانرا بوو ئەوا شوێنی دەسەڵاتی بەریتانیا بوو کە بریتی بوو لە دۆڵی رافیدەین ئەو ناوچەیە کە لە خانەقینی باشووری کوردستان درێژ دەبێتەوە بەرەو سەرەوە تاکو باشووری کوێت[22]. وە مەڵبەندی دەسەڵاتی فەرەنسا کە (شین) بوو کە بەشێوەیەکی سەرەکی سوریا و لوبنانی ئێستا و بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا بەمانا (کوردستانی باکوری ڕۆژئاوا)ی دەگرتەوە[23].

بەلآم بە حوکمی ئەوەی کە روسیا ڕۆڵی زۆر سەرەکی هەبوو ئەوسا بۆیە هەردولا بیریان لەوە کردەوە کە روسیا بکەنە هاوپەیمانی خۆیان لەو پرۆژە ئیستعماریە، سازانۆف وەزیری دەرەوەی ئەو کاتی روسیا لە نیسانی ١٩١٦ ڕەزامەندی ولآتەکەی لەسەر پرۆژەکە راگەیاند بەو مەرجەی کە ناوچەی باکووری ڕۆژهەلآتی تورکیا واتە ناوچەکانی ترابزون وان و بدلیس هەتا ئەو شوێنەی دەکەوێتە ڕۆژئاوای ترابزون لەسەر کەناری دەریای ڕەش هەمووی بە روسیا بدرێ[24]. پسپۆڕێکی ئەم سەردەمە سەبارەت بە رێککەوتنامەی سایکس بیکۆ دەڵێ(ئەم رێککەوتنامەیە بە یەکێك لە ترسناکترین رێککەوتنە نێودەوڵەتیە کۆلۆنیالەکان دادەنرێت دەرهەق بە نیشتیمانی گەلی کورد[25].

بەم جۆرە كوردستانی ژێر دەسەلآتی عوسمانی بە پیَ ی ئەو رێككەوتنە بەسەر هەرسیٚ زل هێز دابەش كرا بۆیە لەم رێككەوتنە كەمترین مافی كوردی تێدا نەبوو وەكو نەتەوەیەكی رۆژهەلآت.

رێككەوتنێكی تری نێو دەوڵەتی كە پەیوەندی داره بە دۆزی كوردبە ناوی (پەیمانی سیڤەر) كە لە ساڵی ١٩٢٠ بەسەر توركیا دا سەپێندرا لە لایەن ولآتە زل هێزە سەركەوتووەكانی جەنگی جیهانی یەكەم وە سوڵتانی عوسمانی ناچار بوو كە مۆری بكات وە لەو كۆنگرەیەش دا دەستەیەكی نوێنەرایەتی كوردیش بەسەرۆكایەتی شەریف پاشا بەشدار بوو، پەیمانەكە لە بارەی كوردستانەوە بە شێوەیەكی تایبەت لە بەشی سێیەم بەندی ٦٢-٦٣-٦٤ باس لە كورد دەكات [٢٦].

كە لە بەندی ٦٢ ی ئەم پەیمانە هاتووە دەڵیٚ (كۆمسیۆنی ئەستەمبۆڵ لە سیٚ ئەندام پێك دێت كە حكومەتەكانی بریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا بە رەسمی دەست نیشانیان دەكەن. هەتا شەش مانگ دوای مۆركردنی ئەو پەیمان ئەو كۆمسیۆنە نەخشەیەك بۆ ئۆتۆنۆمی ئیقلیمی ی ئەو ناوچانە پێشكەش دەكات كە زۆربەی دانیشتوانیان كوردە و كەوتوونەتە رۆژهەلآتی چۆمی فورات و خوارووی ئەرمەنستان، كە دەكریٚ لەمەو دوا سنوریان بۆ دیاری بكریٚ یان كەوتوونەتە باكوری سنوری نێوان توركیا و سوریا و میسۆپۆتامیا وەك لە برگەكانی ٣٧، ١١، ٣ دا هاتووە) [٢٧]. وە لە بەندی ٦٣ دا دەڵیٚ (حكومەتی توركیا بریار لەسەر جیٚ بە جیٚ كردن و پەسەند كردنی ئەو بریارانەی هەردوو لیژنەی ناوبراو دەدات لە ماددەی ٦٣ دا دەست نیشان كراون لە ماوەی سیٚ مانگ دا لە رۆژی ناردنی بۆ حكومەتی ناوبراو) [٢٨].

بەندی ٦٤ (ئەگەر تا ساڵێك پاش مۆرکردنی ئەم پەیمانە، کوردەکانی دانیشتووی ئەو ناوچەیەی لە بەندی ٦٣ دا دیاری کراوە، بە ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلانیان راگەیاند کە زۆربەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە دەیانەوێ لە تورکیا جیا ببنەوە. ئەنجومەنیش دانی بەوە دانا کە ئەوان دەتوانن سەربەخۆ بژین و رایسپارد کە سەربەخۆییان بدرێتێ، تورکیا لە ئێستاوە پابەندی ئەوە دەبێت کە ئەو راسپاردەیە پەسند بکات و لە هەموو مافێکی خۆی لەو ناوچەیە دەست هەڵگرێ. کاتێك حکومەتی تورکیا دەستبەرداری ئەو مافانە دەبێت، ئەگەر کوردەکانی ویلایەتی موسڵ بە ئارەزووی خۆیان و ویستی خۆیان بچنە پاڵ ئەو حکومەتە کوردە، هاوپەیمانە گەورەکان هیچ چەشنە بەرگریەك ناکەن[٢٩].

بەوردبوونەوە لە بەندەکانی سیڤەر و لە رووداوەکانی دوای سیڤەر بۆمان دەردەکەوێ کە زل هێزەکان و بە تایبەتی بەریتانیا بەپێ ی بەرژەوەندیەکانی خۆی ئەم خاڵانە و وە پەیمانەکانی دواتریشی دارشت.

سەرەتا پەیمانی سیڤەر گەرچی لە رواڵەت بۆ یەکەم جاربوو دان بە مافی کورد وەك نەتەوەیەك بنێت بەڵام خۆی لەخۆیدا بۆ یەکەم جاریش بوو لە مێژووی نوێ دا کە بەرەسمی بریاری دابەش کردنی کوردستان لە دەزگایەکی نێو دەوڵەتی بدرێت[٣٠]. ئەوەی لە بەندەکانیش هاتووە سەرەتا تەنها ئاماژە بە حوکمی زاتی بۆ کوردەکانی باکوور کراوە نەك هەموو کوردستانی عوسمانی جگە لەوەش کە کوردستانی رۆژهەلاتیش هەر باس نەکرابوو[٣١]. ئەگەر بەراستی مەبەستیان دروست کردنی دەوڵەتی کوردی بووە، بۆچی پەیمانی سیڤەر سنوری کوردستانی دابەش دەکاو دروست بوونی دەوڵەتی کوردی لە

ژێر کۆمەڵێ مەرجدا دیاری دەکرێ. بەڵام کۆمەڵێ وڵاتی تر راستەوخۆ
گەیەندران کە سەربەخۆن[٣٢].

سەرەتادا ئینگلیزەکان پێیان وابو دەوڵەتێکی کوردی لە بەشێکی
کوردستان لە ژێر سەرپەرشتی خۆیان دەبێتە بەربەست لە بەردەم
بڵاوبوونەوەی بیرۆکەی بەلشەفی وە سنورێك بۆ درێژبوونەوەی ئیمپراتۆریەتی
نوێ ی روس دادەنرێ[٣٣]. وە تورکیا و روسیا لێك جیا دەکاتەوە هەروەها لە
هاوکاری نێوان کوردەکان و کەمالیستەکان تۆقی بوون دەیان ویست ئەنەدۆڵی
رۆژهەڵات (کوردستان) کە خەڵکەکەی پشتیوانی کەمالییەکان بوون جیا
بکەنەوە، مەبەستیان لە پەیمانی سیڤەر پچڕ پچڕ کردنی ئیمپراتۆری عوسمانی
بوو بە جۆرێك کە ئەو دەوڵەتانەی دادەمەزرێنن، راستەوخۆ یان ناراستەخۆ
لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتە زل هێزەکاندا بن[٣٤].

هەر لەبەر ئەم هۆکارەش بوو، یەکێتی سۆڤیەت سەرگرتنی پەیمانی سیڤەری
بە هەڕەشەی ترسناك لەسەر رەوشی ئایندەی خۆی دەزانی بۆیە لە هەمو
روێکەوە پشتگیری لە حکومەتی کەمالیەکان دەکرد بۆ لەبار بردنی
پەیمانەکە[٣٥].

بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێ کە دەوڵەتە زل هێزەکانی ئەو سەردەم لە
پێناوی بەرژەوەندی خۆیاندا وازیان لە کورد هێنا لە کاتێکدا کە باشترین
دەرفەت بوو بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی- هەرچەندە کە دەوڵەتێکی
سەرتاسەری نەبوو بەڵام جێ بە جێ کردنی ئەم پەیمانە دەسکەوتێکی باش
بوو بۆ گەلی کورد بەڵام پەیمانی سیڤەر وەك تاکتیکێکی کاتی زل هێزەکان بو
نەك بەشێك بێ لە ستراتیژیەتی ئەوان. بەم شێوەیە بە پاڵپشتی عەسکەری

هەندێ لە هاوپەیمانەکان وەکو فەرەنسا و ئیتالیا هەروەها سۆڤیەت کەمالییەکان بوونی خۆیان لە تورکیا کردەئەمری واقیع ئەو رەوشەی ئەوسا هەمووی لەبەرژەوەندی کەمالییەکان و لە دژی کورد بوو[٣٦]. بەم پێ یە بەگوێرەی گۆڕانی رووداوەکان هاوپەیمانەکان بەتایبەتی بەریتانیا لە ساڵی ١٩٢٣ دا کۆنگرەی لۆزانیان ئیمزاکرد کە بە هیچ جۆرێك باسی مەسەلەی کورد نەکراوە[٣٧].

بەم شێوەیە لە کۆنگرەی لۆزاندا هەموو ئەو تەنازولاتانەی کە لە لایەن دەوڵەتانی هاوپەیمان دەکرا لە بەرژەوەندی تورکیادا بوو کە هەموویان لەسەر حیسابی کوردەکان و ئەرمەنەکان بوو بەمەش پەیمانی (سیڤەر) لەسەر حیسابی ئەم دەوڵەتانە پوچەڵ کرایەوە[٣٨].

دوا بەدوای ئەم هەنگاوانە وڵاتانی زل هێز نەك هەر وازیان لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی هێنا بەڵکو یارمەتی ئەو دەوڵەتانەیان دەدا کە کوردیان بەسەردا دابەش کرابوو، بۆ لە ناو بردن و سەرکوت کردنەوەی راپەرین و شۆرشەکانی کورد لە ناوچە جیا جیاکانی کوردستان کە بۆ سەربەخۆیی و مافەکانی خۆیان تێدەکۆشن.

ئەوە بوو راپەرینێکی گەورە لە ساڵی ١٩٢٥ لە کوردستانی تورکیا بەرپا بوو[٣٩]. بەسەرکردایەتی شێخ سەعید کە لە ماوەیەکی کەم مەودایەکی بەرینی گرتەوە، وە یەکێك لە بەرچاوترین دروشمەکانی ئەو راپەرینە دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ بوو[٤٠].

لەسەرەتا کوردەکان توانیان زیانی گەورە بە تورکەکان بگەیەنن و سوپاکەی بشکێنن بەڵام لە دوای ئەوەی فەرەنسا زۆر یارمەتی تورکیای دا لە رێگەی

خەتی شەمەندەفەری سوریاوە بۆ سەرکوت کردنەوەی شۆرشەکە وە توانیان شۆرشەکە سەرکوت بکەنەوە[٤١].

وە بەهەمان شێوە یەکێتی سۆڤیەت لە رووخاندنی حکومەتی کورد لە شەڕی ئاگری داخ لە کوردستانی تورکیا لە ساڵی ١٩٢٧-١٩٣٠دا لەچیای ئارارات رۆڵێکی گرنگی بینی کە هەندێ سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەو حکومەتە یەکەم حکومەتی کوردی بووە کە ئاڵای کوردستانی لە ناوچە ئازاد کراوەکاندا بەرز کردۆتەوە[٤٢].

لە ساڵی ١٩٣٠ شێخ مەحمود لە نامەیەکیدا بۆ کۆمیسەری بەریتانیا لە بەغدا بە پەرۆشەوە باس لە هەستی دۆستایەتی کوردەکان بەرامبەر بە بەریتانیا دەکات وە بەناوی گەلی کوردەوە داوای لێ دەکات کە لە قەید و بەندی حکومەتە عەرەبیەکان رزگار بن و لێیان جیا ببنەوە و بکەونە ژێر سەرپەرشتی بەریتانیاوە.

بەڵام سیاسەتی بەریتانیا لەوەدا بوو کە حکومەتی نوێی عێراق بەهێز بکات بەرژەوەندی خۆی لە عێراقدا دەبینی نەك لە دەوڵەتی کورد بەم جۆرە نەك داواکاریەکانی شێخ مەحمودی جێ بە جێ نەکرد بەڵکو کەوتە کار بۆ سەرکوت کردنی شۆڕشی شێخ مەحمود[٤٣].

دەوڵەتانی زل هێز بۆ پەیوەندی خۆش کردن لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی کە کوردیان بەسەر دابەش کرا بوو وە بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندیە سیاسی و ئابووریەکانی خۆیان لەم ناوچەیە یارمەتی ئەو دەوڵەتانەیان دەدا بۆ لەباربردنی هەر هەوڵێکی کورد بۆ سەربەخۆیی.

وە بەریتانیا لە تەموزی ١٩٣٧ ڕێککەوتن نامەی سەعد ئابادی ئیمزا کرد لە نیوان ئێران و عێراق و تورکیا بە حوکمی ئەوەی کورد لەو سێ دەوڵەتە بە ڕێژەیەکی زۆر هەیە بۆ زیاتر بەدەست هێنانی بەرژەوەندیەکانی خۆی لە ناوچەکە[٤٤].

هەر بۆیە لە قۆناغی هەردوو جەنگدا ١٩١٨-١٩٣٩ دەردەکەوێت کە دەوڵەتانی ئینگلیز و فەرەنسا وەك بەرەیەك و سۆڤیەت لە بەرەیەکی تر لە پێناوی پاراستنی پێگە پابووری و بەرژەوەندی یە عەسکەری و ئەمنی یەکانیان لە ناوچەکەدا بەربەستی سەرەکی بووینە لە بەردەم چارەسەرکردنی دۆزی کورد[٤٥].

ڕووداوەکانی دوای جەنگی جیهانی دووەم دەرفەتێکی تر بۆ دروست بوونی دەوڵەتێکی کوردی ڕەخساند، قازی محەمەد کە یەکێکە لەسەرکردە ناودارەکانی کورد دوای ئەوەی کە لە یارمەتی دانی بەریتانیا بێ ئومێد بوو، ڕووی لە یەکێتی سۆڤیەت کرد بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی بەم جۆرە قازی مەحەمەد بە پاڵپشتی یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٤٦ لە شاری مەهاباد کۆماری کوردستانی ڕاگەیاند [٤٦].

بەڵام بە تێپەربوونی کەمتر لە ساڵێك بەسەر تەمەنی کۆماری مەهاباد یەکێتی سۆڤیەت لە پێناو بەرژەوەندیەکانی خۆیدا پشتی کردەوە کۆماری مەهاباد ئەو کۆمارە کە هەر خۆی لە پێشدا دەستی هەبوو لە دامەزراندنیدا بەڵام هەر خۆشی ڕێگای بۆ دەوڵەتی تاران خۆش کرد کە پەلاماری کۆماری مەهاباد بدات[٤٧].

پاش جەنگی جیهانی دووەم ئەمەریکا رۆڵی زۆر بوو لە سیاسەتی نیو دەوڵەتی دا بەڵام ئەو دەوڵەتە کوردستانی نەکردبووە ئامانجێکی خۆی بەرژەوەندی لەوەدا بوو جوڵانەوەی نەتەوەی کورد بە لاوازی بمێنێتەوە نەبێتە هۆی جێ پێ لەق کردنی ئەو رژێمە کۆنە پەرستانەی سەر بە رۆژئاوان وەکو تورکیا و ئێران و عێراق(٤٨).

هەر بۆیە لە ساڵی ١٩٥ ئەمریکا هەروەك چاودێر هەندێ لە رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستانی لە بەغدا کۆکردەوە بۆ ئەوەی پەیمانێکی هاوکۆ لە دژی جوڵانەوەی رزگاریخوازی کورد ببەستن بەپێ ی بەندی حەوتی ئەم پەیمانە دەبوو هەموو هێزەکان یەك بخرێن لە پێناو بزاڤە رزگاریخوازەکان لە ناوچەکەدا بە تایبەتی بزاڤی رزگاریخوازی کورد(٤٩).

بەڵام لە کوردستانی عێراق لە ساڵی ١٩٦١ شۆرشێکی گەورە بەرپا بوو کە تا دەهات لە گەشە سەندن دا بوو، گوشارێکی زۆری خستە سەر حکومەتی عێراق تا ناچاری کرد رێککەوتنی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ لەگەڵ مۆر بکات کە بە پێ ی ئەو رێککەوتنە دەبوایە بەتەواوەتی دان بە کەسایەتی نەتەوەی رۆشنبیری کورد بنێ وە خود موختاری بدات بە کورد لە چوار چێوەی عێراق(٥٠). بەڵام حکومەتی عێراقی بەرە بەرە لە پاش گەزبوونەوەدا بوو لەو رێککەوتنە ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٧٤ ئەو ئۆتۆنۆمیە زۆر شوێنی حەساسی لە کوردستان دابڕی بوو بۆیە شەڕ دەستی پێکردەوە(٥١). تا مانگی ئازاری ١٩٧٥ رێککەوتنامەی جەزائیر مۆرکرا بەسەر پەرشتی ئەمریکا کە بەپێ ی ئەو رێککەوتنە دەسەڵاتدارانی سنوریان داخست و بە کوردەکانی عێراقیان راگەیاند کە شۆڕش تەواو بوو(٥٢).

خاڵی سەرەکی ئەو ڕێککەوتنامەیە ئەوە بوو عێراق پشت لە شۆڕشی کورد بکات و عێراقیش بەشێك لە شەتلعەرەب (شط العرب) بە ئێران بدات(٥٣).

بەم شێوەیە بزاڤێکی گەورەی تری کوردەکان کەوتە نێو داوی پلانی نێودەوڵەتان بووە قوربانی بەرژەوەندیەکانی خۆیانەوە مومارەسەی گۆڕانکاریە سیاسیەکانی دۆزی کوردیان کردوە لە ناوچەکەدا بە بەرژەوندیان زیاتر لە گەڵ ئەو دەوڵەتانە دەگونجا کە کوردیان بەسەر دابەش کراوە.

بەڵام لەبەر ئەوەی جێ ی سەرنجە کەوا کوردستان چەند تایبەتمەندیەکی هەبوو کە جێگای بایەخ و سەرنج و بەرژەوەندی زلهێزەکان بوو هەر ئەم تایبەتمەندییەش بوو کەوا تا ڕادەیەکی زۆر کاریگەری هەبوو لەسەر پرۆژەی دەوڵەتی کوردی.

هەندێك لە نووسەران داڕشتنی سیاسەتی زلهێزەکان بەرامبەر بە کوردستان و دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردی دەگەڕێننەوە بۆ دوو هۆکاری سەرەکی یەکەمیان شوێنی ستراتیژی کوردستان و دووەمیان دەوڵەمەندی کوردستان لە ڕووی پترۆڵەوە (٥٤)

١- شوێنی ستراتیژی کوردستان .

٢- مەبەست لە هەڵکەوتەی جیۆپۆڵەتێکی کوردستان ، واتە شوێنی کوردستان سەبارەت بە ڕووبەرەکەی کە کاریگەری ئەم شوێنە لە سەر بارودۆخی سیاسی و ستراتیژی ئەم ناوچەیە هەیە .

جیۆپۆلەتێك ناسی ئینگلیزی هالفۆر ماکنیدەلرکە خاوەن تیۆری ( Heart hand) واتە ( دڵی زەوی ) کوردستان بە بەشێك لە ناوچەی کەوانەی ناوخۆ دادەنێ کە کەوانێکە دەوری دڵی زەوی داوە ، بۆیە ماکندەلر بە پێویستی

زانیوە کە دەوڵە تانی کەوانی ناوخۆ بەهێز بکرێن تا بتوانن ئەرکی بەرهەڵستی کردن و گەمارۆدانی دڵی زەوی بەجێ بگەیەنن [٥٥] .

کوردستان لە ڕووی ستراتیژەوە گرنگی یەکی تایبەتی خۆی هەبووە کۆنترۆڵکردنی مەرجێکی پێویست بوو بۆ دابین کلردنی دەسەڵاتی سیاسی و پاراستنی ڕۆژهەلاتی نزیك و ناوەڕاست [٥٦] . بەم شێوەیە ئەم شوێ نە ستراتیژەی کوردستان بوتە هۆی چاوتێبڕینی زلهێزان لە ناوچەکە .

٣– نەوتی کوردستان .

- بێ گومان نەوت لە ئابووری جیهانیدا بایەخێکی زۆری هەیە بە ڕادەیەکی وا کە هێزێکی زۆر دەدات لە ڕووی سیاسی و سەربازی و ئابووریەوە بۆیە ئەو شوێنانەی کە نەوتیان زۆرە ، هەموو کات جێگای سەرنج و بایەحی وولاتانی زلهێز بوونە .

لە ڕووی سامانی سروشتی و کانزایی یەوە کوردستان زۆر دەوڵەمەندە نەوت گرنگترین سامانی کوردستانە نەوت بە شێوەیەکی سەرەکی لە کوردستانی عێراق لە ناوچەکانی کەرکوك و زمارو خانەقین ، لە کوردستانی تورکیا دا لە سیرت و باتمان ، لە کوردستانی ئێراندا لە کرماشان ، لە کوردستانی سوریا لە تەرەچوك نەوت دەردەهێنرێ [٥٧]. شایانی باسە نوری سەعید دەرکی بەوە کردبوو کە دۆزی پەترۆڵی کوردستان تا چ ڕادەیەك پەیوەندی بە بەرژەوەندی دەوڵەتە گەورەکانەوە هەیە لە ناوچەکەدا .

بۆیە لە ئەیلولی ١٩٣٠ دا ڕایگەیاند ئەگەر دۆزی پەترۆڵ لە سیاسەت داماڵرێ چارەسەری دۆزەکە زۆر ئاسانە [٥٨].

هاوکات لە گەڵ شوێنی ستراتیژی کوردستانو بوونی نەوت وەکو سەرچاوەیەکی ئابوری بەهێز لە ناوچەکە ، دەوڵەتە زلهێزەکان دروست کردنی دەوڵەتێکی کوردیان لە بەرژەوەندی خۆیان نەدەزانی بەڵکو کوردستانیان دابەش کرد بەسەر دەوڵەتانی چواردەوری بۆئەوەی بەرژەوەندیەکانی حۆیان بە دەست بهێنن لە ناوچەکە لە سۆنگەی ئەو دەوڵەتانەی کوردیان بە سەر دابەش کراوە ، وە لە لایەکی تر کورد وەکو یەکێك بەکاربهێنن ئەگەر هاتوو ئەو دەوڵە تانە رووبەڕوی بەرژەوەندی وولآتانی زلهێز وەستان لە ناوچەکە .

٢- هۆکاری ناوچەیی .

بێ گومان یەکێکی تر لە هۆکارەکانی دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیاسەتە شۆڤینیەی دەوڵە تانی ناوچەکە کە کوردستانیان بە سەر دابەشکراوە بەرامبەر بە کورد پەیڕەوی دەکەن لەگەڵ ئەوەشدا کە چارەسەری کێشەی کورد لەو دەوڵەتانەدا هۆکارێکی ڕاستەقینەی ئارامی و ئاسیش و حوکمی ئەو دەوڵەتانەیە بەلآم ئامادەنین کە کێشەی کورد چارەسەرێکی بۆ بکەن بگرە لەمەش زیاتر بەردەوام هەوڵی سەرکوت کردنەوەی هەر بزاڤێکی شۆڕشگێڕی کورد دەدەن لە ناوچەکە بۆیە بە جیا باس لە بایەخی سیاسی و ئابووری ستراتیژی کوردستان بۆ ئەم دەوڵە تانەی کوردستانیان بەسەر دابەش کراوە دەکەین .

١- عێراق :

یەکێك لە تایبەتمەندیە هەرە سەرەکیەکانی کوردستانی عێراق بوونی سەرچاوەیەکی یەکجار زۆری نەوتی یە لەم ناوچەیەدا . کە گەورەترین یەدەگی

سەرەکی و بنچینەیی نەوتی عێراق لە ناوچەکانی کەرکوك دایە کە ناوچەیەکی کورد نشینە . چاڵە نەوتەکانی کەرکوك یەکێك لە سەرچاوە مەزنەکانی نەوتی جیهان پێك دەهێنن . کە زۆربەی نەوتی عێراق لە چاڵە نەوتەکانی کەرکوك دەردەهێنرێ لە کۆتایی ساڵی ١٩٥٥ دا ، ٤٤ چاڵە نەوت لە ناوچەی کەرکوك خرایە گەڕوو هەر لە هەمان ساڵدا ٢٥ ملیۆن تەنی لێ دەرهێنرا [٥٩]. هەروەها کوردستانی عیراق کە دەکەوێتە باکوری عێراقەوە ، بایەخێکی ستراتیژی و جیوپۆلەتیکی بۆ ئەو وولاتە هەیە . ئەگەر عیراق ناوچە شاحاوییەکانی باکوری وولاتی لە دەست بدات ، ئەو تاکە بەربەستە سروشتیەی لە کیس دەچێ کە دەشتەکانی پێدەپارێزێ و ئەو کات موسڵیش کە گەورەترین سێ یەم شاری عێراقە دەکەوێتە سەر سنوورەوە هەروەها لە دەست دانی ناوچە شاخاویەکانی بەغداش دەکەوێتە بارێکی ناجۆرەوە سەرەڕای ئەوەش
عێراق ناوچە دەوڵەمەندە نەوتیەکانی بە لە دەست دانی کوردستان لە دەست دەچێ بێ گومان لە ڕووی ئابوریەوە زۆر زیان بەخشە ، هەروەها ئاوی دوو دەریاچەکەی دەربەند یخان و دووکانیشی لە دەست دەچێ کە بۆ کشتوکاڵی ناوچەکانی دیالەو حەویجە بایەخێکی زۆریان هەیە [٦٠].

هەر لە بەر ئەم هۆیانە دوابەدوای لکا ندنی ئەو بەشەی کوردستان بە عێراقی عەرەبی حکومەتە یەك لە دوا یەکەکانی عێراق بەردەوام هەوڵی یەك پارچەیی خاکی عیراقیان داوە ، وە زۆر بەتوندی بەرپەرچی هەر هەوڵێکی بزافە ڕزگاریخوازەکانیان داوەتەوە کە هەوڵی ڕزگارکردنی ناوچەیەکیان دابێ بگرە لە وەش زیاتر حەڵکیان لە ناوچە کودنشینەکان ڕاگوێستوێتەوە بۆ سڕینەوەی بە کوردستانی بوونی ئەم ناوچانە بە تایبەتی ئەم ناوچانەی کە ڕۆڵێکی گرینگ

دەبینن لە داهاتی نەتەوەی عیراق وەکو کەرکوك بە تایبەتی لە دوای هاتنە سەر دەسەلاتی بەعسیەکان کە هەموو شێوازێکی یان گرتە بەر بۆ لە ناوبردنی کورد بە نموونەی ئەنفال و کیمیا باران کردنی کورد لە شارە جیا جیاکانی کوردستانی عیراق بۆ ترسان و تۆقاندنی و کەم کردنەوەی ڕێژەی کوردەکان بۆ لە باربردنی هەر هەوڵێکی ڕزگاریخوازی لە ناوچەکە دا .

**٢- لە تورکیا :**

کوردستانی تورکیا ناوچەیەکی سەخت و شاخاوی یەو دوو ڕووباری بەناوبانگ و پڕ بایەخی وەکو دیجلەو فوڕات تێیدا سەرچاوە دەگرێت کە بایەخێکی ئابووری ستراتیژی بۆ تورکیا هەیە لە گەڵ ئەوەی کە بایەخێکی یەکجار زۆری بۆ دەوڵە تی تورکیا هەیە سەرەڕای ئەوەش تورکیا هەوڵ دەدات وەکو کارتێکی فشار دژی سوریاو عێراق بەکاری بهێنێ . لە گەڵ ئەوەشدا ڕێگاکانی بازرگانی تورکیا و ئێران و عێراق و وولاتانی ئاسیای بە کوردستانی تورکیادا تێ دەپەڕێ[٦١] .

بەم شێوەیە بەدیاردەکەوێت کە کوردستانی تورکیا بایەخێکی یەکجار زۆری ئابووری و سیاسی و ستراتیژی بۆ دەوڵەتی تورکیا هەیە وە ئاسایشی نەتەوەیی خۆی بە کوردستان بەستاوەتەوەو وەکو بەشێك بە خاکی خۆی دەزانێ . لە پاش دامەزراننی تورکیای نوێ تورکیا بە توندو تیژترین شێوە سەرکوتی هەموو بزافە ڕزگاریخوازەکانی کردوّتەوە وە هەوڵی گۆڕینی ناسنامەی نەتەوایەتی کوردی داوە بە شێوەی جۆراوجۆر .

**٣- ئێران :**

کوردستانی ئێران گرینگییەکی زۆری بۆ ئێران هەیە بە تایبەتی لە ڕووی ئابوورییەوە ئەوەتا نەوتی ئێران بەشێوەیەکی سەرەکی لە کرماشان دا هەیە لە ئایاری ١٩٥١ دا بەرزترین پلەی دەرهێنانی نەوت ٣٥,٤ ملیۆن تەن بوو تێکڕای بەرهەمی هەر چاڵێك لە یەك ساڵدا ٤٣٧,٣ هەزار تەن بوو هەر لە هەمان ساڵدا ئێران لە ڕووی فرۆشتنی نەوتەوە بە پلەی دووەم دەهات گومانی تێدانی یە کە بەشێکی زۆری ئەو نەوتەش لە کوردستانە [٦٢].

بەم شێوەیە کوردستانی ئێران بەشێك لە داهاتیی نەتەوەیی ئێران پێك دەهێنێ وە جیابوونەوەی کوردستانی ئێرانیش لێدانێکی کوشندەیە ئاڕاستەی ئاسایشی نەتەوەیی ئەم وڵاتە دەکرێ بۆیە حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی ئێران تەئکیدیان لە سەر یەك پارچەیی خاکی ئێران کردۆتەوە وەسەرکوتی هەموو بزاف شۆڕشگێڕە کوردیەکانیان کردووە بۆ ئەوەی نەبێتە مەترسی لە سەر بەرژەوەندی خاکی ئێران.

٤- **سووریا :**

ڕووبەری ئەو بەشەی کوردستان کە بە سووریا لکێنراوە دەگاتە ١٨,٣٠٠کیلۆمەتری چوارگۆشە کە دەکاتە ١١٪ ڕووبەری گشتی سوریا پێکدێنن[٦٣]. ئەم ناوچەیە بایەخێکی باشی بۆ سووریا هەیە وەمەڵبەندی جەزیرە نەوتی تێدا دەرکەوتووە بەڵام کوردەکان لە شوێنەکانی خۆیان دەردەکرێن بۆ شوێنی دوور لە بیابان دووردەخرێنەوە کوردەکانی سوریا لە هەموو مافی نەتەوایەتی بێ بەش کراون [٦٤]. بەم شێوەیە تورکیا ڕێگە. بە هیچ

بزافێکی کوردی نادات کە هەوڵی سەربەخۆیی بدات وەبەشێکی گشتی ئەو دەوڵەتانەی کە کوردیان بە سەر دابەش کراوە ئەگەر لە نێوان خۆشیان ناکۆکیان هەبێ ئەوا سەبارەت بە کێشەی کورد کۆکن و سیاسەتی نەگۆڕیان هەیە و هەوڵی ئەوە دەدون کە کورد نەگاتە ئاستی دامەزراندنی کیانێکی سەربەخۆ وە هەمیشە هەر چوار دەوڵەت هاریکاری یەکتریان کردووە بۆ سەرکوت کردنەوەی بزافە کوردیەکان لە هەر پارچەیەکی کوردستان دا ئەگەر گەیشتبێتە ئاستی پێگەیشتن و مەترسی لە سەریان.

## بەشی سێ یەم

### هۆکارەکانی ناوخۆیی

هۆکارە ناوخۆیەکانیش ڕۆڵێکی گرینگ و سەرەکیان بینیوە لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی هۆکارە ناوخۆیەکانیش شێوازی جۆربەجۆریان بە خۆوە گرتووە ، کە هەندێکیان ڕۆڵی سەرەکیان هەبووە وەهەندێکیان ڕۆڵی لاوەکی لە سەرەتادا بۆ ڕوونکردنەوەی کاریگەری هۆکارەکانی ناوخۆیی لە سەر درووست نەبونی دەوڵەتی کوردی پێویست دەکات باری کۆمەلآیەتی کۆمەڵگەی کوردەواری ڕوون بکرێتەوە

١- بەرچاوترین خەسڵەتی سیستەمی کۆمەلآیەتی کۆمەڵگەی کوردی بەدی دەکرێ پەیوەندی خێلەکی یە کە سیستەمی دەرەبەگایەتی لە ژێر خۆیەوە

شاردۆتەوە ئەو پێکهاتووە کۆمەڵایەتی یە کە بنچینەیەکی مێژوویی هەیە شوێن پێگەکانی بە ئاشکرا لە سەر ژیانی کورد و هەر تاکێکی کوردیش دیارە بۆیە لە ناو کورد عەشیرەت گەری و خێلەکی – بوون لە پێشەوە دێت لە پێش ووشیاری نەتەوایەتی [٦٥]. سەرکردەو رابەرەکانی شۆرشی کورد زۆربەی لە سەرەك عەشیرەت و سەرەك خێل پێك هاتوون هەر بۆیە بە عەقڵی عەشیرەت گەریەوە مامەڵەیان لە گەڵ سیاسەت و گۆرانکاری و رووداوەکانی سەردەمی خۆیدا کردووە ، ئەمەیش وای کردووە کە نەتوانن سوود لە گۆران و رووداوە خێراکان وەربگرن و بیخەنە خزمەتی کێشە رەواکەیانەوە لە ئەنجامدا کەوتوونەتە پەراوێزی رووداوەکان [٦٦]. لە سەرێکی ترەوە جوگرافیای کوردستان و سروشتی خاك و ئاو هەواکەی رۆڵیان هەبووە لە دروست بوونی عەشیرەت گەری و خێلەکی بوون وەبوونی دەیان زنجیرە چیا کۆسپ بووە لە بەردەم یەکبوونی کوردو دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی [٦٧] هەڵکەوتەی جوگرافی کوردستان و چیا بەرزەکانی ، بوونەتە هۆی لێك دابرنی کوردەکان و پەرتەوازەیی یان ، ئەمەش کارێکی وایکردووە کە هەر هۆزو خێلێك ، لە چوارچێوەی سنووری جوگرافی بەر تەسکی حۆیدا بمێنێتەوە ، سەختی ناوچەکان و رێگاکانی هاتووچۆی نێوان ئەم ناوچانە لەمپەرێك بووە بەرامبەلر یەکتر نزیك بوونی کوردەکان و وایان لێکردووە هەر عەشیرەتێك لە ناوچەیەکی دیاریکراودا بمێنێتەوە [٦٨] .

لە لایەکی ترەوە ژیانی خێلایەتی کۆمەڵگەی کوردەواری تەنانەت کاری کردۆتە سەر ئابووریکوکوردستانیش ، چونکە لوە هەر ناوچەیەك ئەوەندەی پێویست هەیە بەرهەم دەهێندرێ وە بیلر لە ئابووریەکی پتەو بازرگانی لە نێوان

ناوچەکان نەکراوەتەوە لە کوردستان فاکتەری سەروەت نەبوّتە بزوێنەری مێژوو ئابووری نەبوّتە ژێر خانێکی چەسپاو پتەو بۆ دارشتنی بنەمایەکی پتەو کارامە بۆ دروست بوونی دەولّەت [٦٩].

چونکە باری ئابووری رۆلّێکی گرینگ دەبینێت لە ناو میللەتدا بۆ پێشکەوتن و دواکەوتن ، بەلّکو بە بنچینەی ژیانی نەتەوە دادەندرێت هیچ شۆرش و راپەرین و دەولّەتێك بێ باشی باری ئابووری ناتوانێ خۆی بگرێ [٧٠]. هەر چەندە ئێستا بە هۆی ئەو گەشەکردنەی کە رووی داوە لە بواری تەکنەلۆجیا بە تایبەتی لە بواری گواستنەوەو گەیاندن ئەمە کاریگەری هەبووە لە سەر نەمانی ئەو گەمارۆیە جوگرافیە کە تا رادەیەکی باش دەوری هەبوولە سەر هەلّدان و گەشەسەندنی سیستەمی خێلاّیەتی و عەشائیرگەری لەم سەردەمەدا ئەم هەستە لاوازبووە بە هۆی کۆچکردنی فراوان و بە کۆمەلّ لە گوندەکانەوە بەرەو شار بەدی دەکرێ بەمە گۆرانێکی گەورە لە پێکهاتەو بوونیادی کۆمەلّگەی کوردەواری روویداوە بەلاّم دەکرێت بلّێین کە هێشتا عەشیرەتگەری لە ناو کۆمەلّگەی کوردەواریدا بەربلاّوە . درێژە کێشانی دەوری سیاسی و ئایدۆلۆژی دەرەبەگ شەرو پێکدادانی حیزبەکان وە بە پیرۆز دانانی سەرکردەکان بۆیە ئەو سلبیاتە زالّ بوو لە جولانەوەکەدا وەکو سیاسەتێکی نامەبدەئی وایکرد شەری لابەلا دروست بێ هەندێ سەرکردە بەرژەوەندی عەشیرەتەکەیان بخەنە سەرووی بەرژەوەندی گشتی [٧١].

٢- ناكۆیی ناتەبایی سەرانی كورد:

ئەوەی لە مێژوویی كورددا بە شێوەیەكی دیار بەرچاو دەكەوێ ناكۆكی و ناتەبایی سەركردە و پارتە سیاسیەكانی كوردە بەردەوام بە دوو ئاڕستەی جیا كاریان كردووە وەبەرژەوەندیەكانی خۆیان لە پێش بەرژەوەندی گشتی داناوە بە عەقلیەتێكی خۆویستانە سەیری مەسەلەكانیان كردووە ئەوەتا لە دوای جەنگی یەكەمی جیهانی كە هەلێك بوو بۆ دامەزراندنی دەولەتی كوردی بەلام دووبەرەكی سەرانی كورد هۆكارێكی سەرەكی بوو بۆ هەلوەشاندنەوەی پەیمانی سیڤەرو داگیركردن و دابەشكردنی كوردستان كە بەرەیەك لە ئەفسەرو سەركردە خێلەكیەكان تەواو لە ژێر كاریگەری دیماگۆجیەتی ئەتاتورك بوون وە باوەڕیان بە دەولەتی كوردی نەبوو[٧٢]. هەر ئەوانیش بوون بە قسەی مستەفا كەمال تەلەگرافیان بۆ كۆنگرەی ئاشتی پاریس و سەرۆكی ئەمریكا كرد دەیانگووت ئێمە سەربەخۆییمان ناوێت و دەمانەوێ لە گەلّ توورك وەكو برا لە توركیا بژین[٧٣]. هەرچی بەرەی ڕۆشنفكرانی ناسیۆنالیستی بوون ئەوانیش هەر چاوەڕوان بوون كە ڕۆژئاوا دەولەتیان بۆ دروست بكات بەم شێوەیە كورد بووە دووبەرە بەرەیەكیان ڕاستەوخۆ پشتی كەمالیەكانیان گرت ئەوی تریش دبلۆماسیەتیەكی ناكامل و عەقلیەتێكی سادە كە هەردوولا بوونە هۆی سەركەوتنی كەمالیەكان [٧٤].

وە لە لایەكی ترەوە هەندێ لە خێلّ و ئاغاكانی كوردستانی باشووریش باوەڕیان هێنا بە حكوومەتی فەیسەل دژ بە بزاڤی ڕزگاریخوازانەی گەلی كورد كەوتنە هاریكاریكردنی دەولەتی عێراق [٧٥]. وە بە هەمان شێوە لە خەباتی

نویێ ی گەلەکەشما ن دا ئەو ناکۆکی و دژایەتی یە ناوخۆی یە بەردەوام بوو لە ساڵی ١٩٣٩ حزبی هیوا کە خزبێکی بە هێز بوو زۆربەی چین و توێژەکانی گەلی گرتبووە خۆی کەچی ناکۆکی کەوتە نێوان سەرکردەکانیەوە لە سەر گەیشتن بە ئامانج هەندێك دەیانگووت دەبێ پشت بە یەکیەتی سۆڤیەت ببەستین کە باڵی چەپ بوون هەندێکی تر دەیانگووت پشت بە بەریتانیاو هاوپەیمانەکان ببەستین لە ئەنجامدا ئەو حزبە بوو بە دوو بەش [٧٦]. هەر لەم ڕوانگەیە دوای دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان ناکۆکی لە نێوان باڵی مەکتەبی سیاسی و سەرۆکی پارتەکە مەلا مستەفای بارزانی درووست بوو [٧٧]. ئەم شەڕو ململانێ یە لە نێوان ئەم دوو لایەنە بەردەوام بوو تا ڕێککەوتنی ١ ی ئاداری ١٩٧٠ جارێکی تر هەردوولا تێکەڵ بە یەکتلر بوونەوە بەڵام لە ڕاستیدا ناکۆکیەکان لە ژێرەوە هەر بۆ دەرفەت دەگەڕان تاوەکو لە دووای هەرەس هێنانی شۆڕش لە سا ڵی ١٩٧٥ دووبارە شەڕ لە نێوان پارتە سیاسیەکانی کوردستان هەڵگیرساوە[٧٨]. شەڕی ئەو حزبانە لە گەڵ یەکتر وایکرد کە چەندەها جیابوونەوە لە بزافی کورد دروست بێ زۆربەی ئەو جیابونەوانەش بە بێ خوێن نەبووە وە ئەو پەتای جیابوونەوە ئاکامی فرە حزبایەتی لێکەوتەوە وە ئەمە تەنها هەر لە بەشی باشووری کوردستان نەبوو بەڵکوو پەتاکە ئەوەندە بە هێز بوو ڕۆژهەڵات و باکوریشی تەنیەوە کە پارتی گەل لە پارتی دیموکراتی کوردستان جیابۆوە لە بە شی باکوور بێجگە لە پارتی کرێکارانی کوردستان p . K. k و سۆسیالیست هەموو پارتەکانی تر لە پارتی دیمەکراتی کوردستانی تورکیا جیابوونەوە [٧٩].

ـە کوردستانی ڕۆژهەڵاتیش لە دووای تیرۆرکردنی قاسملو دیموکرات بوو بە دوو
ـەشەوە، پارتەکانی سوریاش وەك نەوشیروان مستەفا دەڵێ :
ەمندێکیان سەر بە پارتین و هەندێکیان سەر بە یەکیەتین [٨٠].

ـەم شێوەیە پارتە سیاسیە کوردیەکان لە هەموو بەشەکانی کوردستان لە بەر
ـملانێ ی نێوان یەکتری وە ئارەزوویان بۆ دەسەڵات ململانێ یان لە گەڵ
ـاگیرکەرانی کوردستان لە بیرکردبوو لە بەر شەڕی نێوان خۆیان شەڕی
ـاگیرکەرانی کوردستانیان فەرامۆش کردبوو.

## ئەنجام

١- بەرژەوەندی ولاتە زلهێزەکان پاش جەنگی یەکەمی جیهانی بە تایبەتی بەریتانیا لەوەدا بوو کە چەند دەوڵەتێك لە دەوروبەری کوردستان دروست بکات بۆ ئەوەی وەکو ئالیەتێك بەکاریان بهێنێ بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان لەم ناوچەیە ئەمە لەلایەك لە لایەکی تر ئەم دەوڵەتانە وەکو بەربەستێك بەکار بهێنێ دژ بە هێرشی فکری سۆڤیەت لە ناوچەکە کە ئەو کات لە پەرەسەندن دا بوو چونکە ولاتە براوە زلهێزەکان وەك بەریتانیا بەتایبەتی پێیان وابوو کە دروست کردنی دەوڵەتی نویێ لە شوێنەواری دەوڵەتی کۆن باشتر دەتوانێ بەرژەوەندیەکانی ئەوان بپارێزێ و لە دەوڵەتێکی کوردی کە خۆیان کۆك و تەبا نین لەسەر دامەزراندنی ئەم دەوڵەتە.

٢- ولاتە زلهێزەکان کوردستانیان دابەش کرد بەسەر (عێراق-تورکیا-ئێران-سوریا) وە هەر یەك لەم دەوڵەتانە دەبوایە بەرژەوندی زلهێزەکانیان بپاراستبوایە لە ناوچەکە هەرکاتێ هەر یەك لەم دەوڵەتانەی کە کوردیان بەسەر دابەش کراوە رووبەرووی بەرژەوەندیەکانی ئەوان ببوونایە ئەوا کوردیان وەکو کارتێکی فشار بۆ سەر ئەم دەوڵەتە بەکار دەهێنا بۆ ئەوەی خواست و ویستی ئەوان جێ بە جێ بکەن وە هەر کاتێك ئەم دەوڵەتانە خواستی ئەوانیان بهێنایەتە دی وە بەرژەوەندیەکانیان بپاراستبوایە ئەوا ولاتە زلهێزەکان یارمەتی ئەو دەوڵەتانەیان دەدا کە کوردستانیان بەسەر دابەش کرا بوو بۆ سەرکوت کردنەوەی بزاڤی شۆرشگێرە کوردەکان.

٣- شوێنی ستراتیژی کوردستان و بوونی دەرامەتێکی زۆری پترۆڵ و سامانی سروشتی لە کوردستان ئەمە وای کرد کە ولاتە زلهێزەکان لە بەرژەوەندی

خۆیان نەدەزانی دەوڵەتێکی کوردی دروست بکەن چونکە ئەم دوو هۆکارە بنەمای بەهێز بوونی دەوڵەتن دروست بوونی دەوڵەتێکی بەهێز لەو ناوچەیەدا نە بەرژەوەندی ئەواندا نەبوو.

٤- هەروەها دەکرێت بووترێت هۆکارێکی تری لکاندنی کوردستان بە عێراقەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ولاتە زلهێزەکان هەوڵیان داوە کەوا هاوسەنگی ناوخۆیی رابگرن لە نێوان مەزهەبی سوننە و مەزهەبی شیعە ئەگەر بێت و کوردستان بەم ناوچەوە نەلکێندرابووایە ئەوا رەوتی شیعە گەری بالاَ دەست دەبوو لە عێراق ئەمەش لە بەرژەوەندی ولاتە زلهێزەکان نەبوو.

بەلاَم دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردی شتێکی حەتمی یە بەڵکو هەر کارێك ئەو دەوڵەتانەی کە کوردیان بەسەر دابەش کراوە کەوتنە دەرەوەی بەرژەوەندی یەکانی ولاتە زلهێزەکان وە بەرژەوەندی زلهێزەکان لەگەڵ بەرژەوەندی کورد یەکی گرتەوە ئەوا دەرفەتێك دەرەخسێ بۆ دروست بوونی دەوڵەتی کوردی بەمەرجێك کورد لە ناوەوە رۆشنبیری و هۆشیاریەکی سیاسی باشی هەبێ وە یەکگرتوو بێ لە رووی سیاسی و ستراتیژیەوە لە ناوخۆ و دەرەوە.

٥- سەبارەت بە ولاَتانی ناوچەیی ئەوا ئەو ولاَتانەی کە کوردیان بەسەر دابەش کراوە هەوڵیان داوە کەوا کورد یەکتر نەگرن دژی بەرژەوەندیەکانی ئەوان ڕانەوەستن وە هەر کاتێکیش ئەم دەوڵەتانە یارمەتی بزاڤێکی کوردیان دابێ لە بەشێك لە بەشەکانی کوردستان ئەوا تەنها وەکو میکانیزمێك ئەم بزاڤەیان بەکارهێناوە دژی دەوڵەتەکەی تر بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندیەکانی خۆیان

بەلأم هەر کاتێك بزاڤەکە بەرەو پێگەیشتن بڕۆیشتبوایە ئەوا ئەم دەوڵەتانە لە نێوان خۆیان رێك دەکەوتن بۆ سەرکوت کردنەوەی بزاڤەکە.

٦- هەروەها هۆکارە ناوخۆییەکانیش دەوری سەرەکیان بینیوە لە دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردی بە تایبەتی پێکهاتەی کۆمەڵگەی کوردەواری کە بە شێوەیەکی سەرەکی پێك دێت لە کۆمەڵە خێڵ و عەشیرەتێك کە هەریەکەیان ناوچەیەکی دیاری کراوی هەیە تەنها پارێزگاری لە بەرژەوەندیەکانی خۆیان دەکەن بەدەر لە کێشەیەکی سەرتاسەری وە زۆر جار لە نێوان ئەم عەشیرەتانە شەڕ و پێك دادانی درێژخایەن رووی داوە زیاتر لەمەش بۆ سەرکوت کردنی یەکتری پشتیان بە دوژمن بەستاوە.

وە ئەوەی بارودۆخی کوردی خراپتر کردووە ململانێ ی نێوان پارتە کوردیەکانە لەسەر بەرژەوەندی تەسکی حزبایەتی و بەدەست هێنانی دەسەلأت بۆ ئارەزووە تایبەتیەکانی خۆیان.

ئەوەی جێگەی داخە گەلی کورد هەرگیز وەك گەلانی تر هیچ جۆرە ئەزموونێکی وەرنەگرتووە لەسەر ئەو سیاسەتە چەوتانەی کە لە رابردوودا شکستیان تێدا خواردووە بەتایبەتی لە ململانێیە ناوخۆییەکاندا کە هەر بەعەقلیەتی چەندین سەدە بەر لە ئێستا مامەڵە لەگەڵ یەکتر دەکەن هیچ سودێکمان لە مێژووی خۆمان بۆ مومارەسە کردنی کاری سیاسی وەرنەگرتووە.

## پەراوێز و سەرچاوەکان

پرۆفیسۆر م. س. لازاریف، کورد و کوردستان– فاکتەرەکانی دروست بوونی کێشەکەی، د. جبار قادر کردوویەتی بە کوردی، لە بلاّو کراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، سلێمانی، ۲۰۰۰ ، ل۱۷.

۲) د. سلێمان عبداللە، موحازەراتی پۆلی چوارەمی گشتی، جوگرافیای هەرێمی کوردستان.

۳) د. شاکر خەسباك، الکرد و المسألة الکردیة، منشورات، لثقافة الجدیده ط٤–بغداد ۱۹۵۹، ص .

٤) دانانی کۆمەلێك مامۆستای زانکۆ (نزهه القلوب)، جوگرافیای هـ. ك. ع، کتێبی سەنتەری برایەتی.

٥) هـ. س. ل ۱۷

٦) الکرد و الحق، ترجمه عزیز عبدالاحد نباتی، مطبعة وزاره الثقافة، أربیل، ۱۹۹۸. ل ۲٥

۷) (تۆمابوا) ژیانی کوردەواری، وەرگێڕانی ئاواز زەنگەنە، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی ۱۹۸۰. ل۱۳

۸) د. شاکر خەسباك، هـ. س. ل۱۹

۹) مەلاتیە (شارێکە لە ویلایەتی خەربووت لە کوردستانی تورکیا).

۱۰) مەرعش (شارێکە لە باکووری حەلەب).

۱۱) شەرەفخانی بدلیسی، شەرەفنامە بدلیس. ل ۹

۱۲) د. جمال رشید احمد و د. فوزی رشید،تأریخ الکرد القدیم اربیل، ۱۹۹۰،ل۱۱۲

١٣) د. جمال رشید احمد و د. فوزی رشید، هەمان سەرچاوە، ل ١١٤.

١٤) د. شاکر خەسباك، الکرد و المسألة لکردیة، ل. ٢٤

١٥) د. شاکر خەسباك، الکرد و المسألة لکردیة ، ل ٢٤-٢٥

١٦) شەرەف خانی بەدلیسی، شەرەفنامە، ل١٣٠

١٧) ابن خلكان، وفيات الاعيان و انباء الزمان، ج٧، دار ماد-بيروت، ص١٣٩، ٦٠٨-٦٨١هـ.

١٨) سەلام ناوخۆش، سێکوچکەی هەرەس، کوردستان، ١٤٣٠هـ- ١٩٩٩ز، ل٤.

١٩) عبد العظيم رضائي، تاریخ دەهەزار ساله ایران، چاپ هفتم- تایسان ١٣٧٥ چاپ و انتشارات: اقبال-مروی، تهران- خیابان جمهوری اسلامی، ج٤، ل ٤٩-٥٠

٢٠) سەلام ناوخۆش، هـ. س، ل٤.

٢١) د. عبدالرحمن قاسملو، کوردستان و کورد، وەرگێڕانی عبدالله حسن وادە، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی پێشەوا، ١٩٧٢، ل ٥٠.

٢٢) محمد سلام، لۆزانی ١٩٢٣ و لۆزانی ١٩٩٠، چاپخانەی کاڵێ، هەولێر-٢٠٠٠، ل٨.

٢٣) د. عبدالرحمن قاسملو، هـ. س، ل ٥٠

٢٤) سەلام ناوخۆش، مەسەلەی کوردستان لە نێوان ململانێ ی تورك و ئینگلیز، ٢٠٠١، ل ٧-٨

٢٥) د. ئازاد نەقشبەندی، رێککەوتنامەی سایکس بیکۆ و کوردستان، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٧)، ١٩٩٨، ل٧.

٢٦) د. عبدالرحمن قامسلو، هـ. س. ل٥٤

٢٠) د. مارف عومەر گوڵ، پەیمانی سیڤەر له سیاسەت و یاسای نێو دەوڵەتاندا. گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژمارە ١٧، ١٩٩٦، ل٢٩-٣٠.

٢٨) د. ولید حمدی، کورد و کوردستان له بەڵگەنامەی بەریتانیا، وەرگێڕانی له عەرەبیەوە، محمد نوری تۆفیق، سلێمانی، ١٩٩٨، چاپخانەی ئۆفسێتی هەواڵ، ل ٢٠.

٢٩) فەرید ئەسەسەرد، کوردستان و مەسەلەکانی ئەمنی قەومی، چاپی دووەم، سلێمانی ٢٠٠٠ له بلاوکراوەکانی سەنتەری ستراتیژی کوردستان، ل١٣٦.

٣٠) سەلام ناوخۆش، سێکوچکەی هەرەس، چاپخانەی ژیان، هەولێر، ساڵی ١٩٩٩، ل٩.

٣١) سەلام ناوخۆش، مەسەلەی کوردستان له نێوان ململانێ ی تورك و ئینگلیز، ٢٠٠١، ل١٥.

٣٢) د. مارف عومەر گوڵ، هـ.س.، ل ٣١.

33) w.w.w. alQyislam. Com. /history/ Bzf3. htm. P2

٣٤) د. عبدالرحمن قامسلو، هـ. س. ل٥٥-٥٦

٣٥) سەلام ناوخۆش، سێکوچکەی هەرەس،ل١٤.

٣٦) محمد سلام، هـ. س، ل٢٠

٣٧) د. عبدالرحمن قامسلو، هـ. س. ل٥٧

٣٨) د. ولید حمدی، هـ. س. ل٢٥

٣٩) د. کمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك له مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، چاپخانەی الأدیب-بەغدا-١٩٨٥، ل٦٧.

٤٠) د. عبدالرحمن قامسلو، هـ. س. ل٥٨– ٥٩

٤١) د. ولید حمدی، هـ. س. ل٢٦–٢٧

٤٢) سلام ناوخۆش، سێکوچکەی هەرەس، ل ١٨.

٤٣) کریس کوچرا، جنبش ملی کرد، ترجمه ابراهیم یونسی، انتشارات نگاه، تهران، ١٣٧٢، ل١٤١

٤٤) محمد سلام، هـ. س، ل ٣٩

٤٥) سلام ناوخۆش، سێکوچکەی هەرەس، ل١٩.

٤٦) حوسێنی مودەنی، کوردستان و ستراتیژی دەوڵەتانی، بەرگی دووهەم، چاپی یەکەم–چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری–هەولێر–٢٠٠١ز، ل٢٦٩–٢٧٠.

٤٧) شێخ جەمال شێخ نوری، فاکتەری دەرەکی و ناوخۆی یەکانی سەرنەکەوتنی بزوتنەوەی کورد، چاپخانەی ئۆفسێتی ژیار، ٢٠٠٢ز، ل٢٧.

٤٨) لازاریف، ئەو هۆکارانەی مەسەلەی کورد پێك دێن، وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە، سعد عبدالله، بێ ساڵ و بێ شوێنی چاپ، ل٣٩.

٤٩) محمد سلام، هـ. س، ل٤٢.

٥٠) د. گوینەر دێشنەر، کورد: گەلی لە خشتە براوی غەدر لێ کراو،گۆرین بۆ کوردی حەمە کەریم مارف، چاپی دووەم، هەولێر ١٩٩٩. ل٢٢٦.

٥١) ) محمد سلام، هـ. س، ل٤٦–٤٧.

٥٢) لازاریف، هـ.س، ل ٤٢–٤٣.

٥٣) محمد سلام، هـ. س، ل٤٨.

٥٤) کامەران ئەحمەد محمەد ئەمین، کوردستان لە نێو ململانێ ی نێودەوڵەتی و ناوچەییدا، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٠، چاپ و ئۆفسێتی دەزگای سەردەم، ل ١٦٥.

٥٥) د. ئازاد نەقشبەندی: بایەخی جیۆپۆلەتیکی شوێنی جوگرافی کوردستان، سیاسەتی دەولی ژمارە١١، ساڵی سێ یەم، ١٩٩٤، ل ٢٢.

٥٦) کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین، هـ.س، ل١٧٢.

٥٧) د. عەزیز شەمزینی، جولانەوەی رزگاری نیشتیمانی کوردستان، وەرگێرانی فەرید ئەسە سەرد، بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، چاپی سێ یەم، سلیمانی ١٩٩٨، ل١٥.

٥٨) کامەران ئەحمەد محمەد ئەمین، هـ.س، ل١٨٨.

٥٩) د. عەزیز شەمزینی، هـ. س، ل١٦،١٧.

٦٠) فەرید ئەسە سەرد، پرۆژەی (دەوڵەتی کورد) و سیستەمی نوێ ی رۆژهەلاتی ناوەڕاست، گۆڤاری سیاسەتی دەولی، ژمارە ١٣، ساڵی ١٩٩٥، ل٥٤.

٦١) مایکل گانتر، عامل کردی در سیاست خادر میانە، ترجمە علی کرمی، مرکز پراو هشمای علمی و متالعات استرتژیك خادر میانە، تهران، ١٣٧٦، ل٣.

٦٢) د. عەزیز شەمزینی، هـ. س، ل ١٧

٦٣) د. عبدالرحمن قامسلو، کورد و کوردستان، ل٢٦.

٦٤) هـ. س، ل٩٩.

٦٥) لازاریف، هـ.س، ل٢٢.

٦٦) شێخ جەمال شێخ نوری، هـ.س، ل٨٦.

٦٧) عبدالرزاق عبدالرحمن محمد: تێڕوانینێك بۆ دۆزی کورد، چاقی یەکەم، ٢٠٠١ز، سلێمانی، کوردستان، ل٤٧.

٦٨) عەتا قەرەداغی: چەمکی دەوڵەت و بزوێنەری مێژوو لە کۆمەڵگەی کوردیدا، چاپخانەی ئۆفسێتی بابان، چاپی یەکەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٥٢.

٦٩) هـ. س، ل٥٧.

٧٠) عبدالرزاق عبدالرحمن محمد، هـ. س، ل٥.

٧١) لازاریف، هـ.س، ل٢٣-٢٤.

٧٢) عبدالرزاق عبدالرحمن محمد، هـ. س، ل٦٦.

٧٣) سلام ناوخۆش، هـ. س، ل٥٢.

٧٤) عبدالرزاق عبدالرحمن محمد، هـ. س، ل٦٦.

٧٥) سلام ناوخۆش، هـ. س، ل٥٣.

٧٦) عبدالرزاق عبدالرحمن محمد، هـ. س، ل٦٦.

٧٧)میرزا محمد ئەمین مەنگوڕی: بەسەر هاتی سیاسیکورد، بەرگی یەکەم، چاپخانەی داناز، ١٩٩٨، سلێمانی، ل٧٢.

٧٨) عبدالرزاق عبدالرحمن محمد، هـ. س، ل٦٧.

٧٩) سلام ناوخۆش، هـ. س، ل٦٠.

٨٠) عبدالرزاق عبدالرحمن محمد، هـ. س، ل٦٧.

## سەرچاوەکان

### ١ـ سەرچاوە کوردیەکان

١- شەرەفخانی بەتلیسی، شەرەفنامە.

٢- پرۆفیسۆر م. س. لازاریف، کورد و دوردستان- فاکتەرەکانی دروست بوونی کێشەکەی، د. جبار قادر کردوویەتی بە کوردی، لە بڵاو کراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٠

٣- د. عبدالرحمن قاسملو، کوردستان و کورد، وەرگێڕانی عبدالله حسن زادە- بنکەی پێشەوا، بێ شوێن، ١٩٧٣.

٤- د. کمال مظهر، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، چاپخانەی ئەدیب-بەغدا، ١٩٨٥.

٥- د. عزیز شەمزینی، جوڵانەوەی رزگاری نیشتیمانی کوردستان، وەرگێڕانی فەرید ئەسەسەرد، بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، چاپی سێ یەم، سلێمانی،١٩٩٨.

٦- د. ولید حمدی، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامەی بەریتانیا، وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە، محمد نوری تۆفیق، ساڵی چاپ کردنی سلێمانی، ١٩٩٨، چاپخانەی ئۆفسێتی هەواڵ، دانانی کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ، جوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق: کتێبی سەنتەری برایەتی-چاپی یەکەم ١٩٩٨- هەولێر- کوردستانی عێراق، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستانی عێراق.

٧- (تۆمابوا)، ژیانی کوردەواری، وەرگێڕانی ئاواز زەنگەنە، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی ١٩٨٠.

٨- سەلام ناوخۆش، سێکوچکەی هرەرس، کوردستان، ١٤٢٠هـ- ١٩٩٩ز.

٩- شێخ جەمال شێخ نوری، فاکتەری دەرەکی و ناوخۆی یەکانی سەرنەکەوتنی بزوتنەوەی کورد، چاپخانەی ئۆفسێتی ژیار، ٢٠٠٢ز.

١٠- عبدالرزاق عبدالرحمن مخمد ، تێڕوانینێك بۆ دۆزی کورد ، چاپی یەکەم ، ٢٠٠١ ، سلێمانی کوردستان

١١- عطا قەرەداغی ، چەمکی دەوڵەت و بزوێنەری مێژوو لە کۆمەڵگای کوردیدا ، چاپخانەی ئۆفیتی بابان ، چاپی یەکەم ، سلێمانی ، ١٩٩٩

١٢- محمد سەلام ، لۆزانی ١٩٢٣ — و لۆزانی ١٩٩٠ ، چاپخانەی کاڵێ ، هەولێر ، ٢٠٠٠

١٣- سەلام ناوخۆش ، مەسەلەی کوردستان لە نێوان ململانێ ی تورك و ئینگلیز ، ٢٠٠١

١٤ — فەرید ئەسەسەرد ، کوردستان و مەسەلەکانی ئەمنی قەومی ، سلێماتی ، چاپی دووەم ، ٢٠٠٠لە باڵوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان .

١٥- حوسێنی مەدەنی ، کوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان ، بەرگی دووەم ، چاپی یەکەم — چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری هەولێر —١٩٩٩

١٦- کامەران ئەحمەد محمد ئەمین ، کوردستان لە نێوان ململانێ ی نێودەوڵەتی و ناوچەیدا ، چاپی یەکەم ، سلێمانی ، ٢٠٠٠، چاپی ئۆفیستی دەزگای سەردەم .

- میرزا محمد ئەمین مەنگوری ، بەسەرهاتی سیاسی کورد ، بەرگی یەکەم ، چـاپخانەی داناز ، سلێمانی ، ١٩٩٨ .
- د .سلێمان عبدالله ، موخاچەراتی پۆلی چوارەمی گشتی ، جوگرافیای هەرێمی کوردستان ،

٢- سەرچاوە عەرەبیەکان

- د. شاکر خەسباك ، الکرد و المسألة لکردیة ، منشورات ، الثقافة الجدیده ، مطبعة الرابعة – بغداد ، ١٩٥٩ .
٢- لوسیارامبۆ ، الکرد والحق ، ترجمه عزیز عبدالله احد النباتی ، مطبعة الوزارة الثقافة ، اربیل ، ١٩٩٨ .
٣- د. جمال رشید احمد ، د. فوزی رەشید ، تاریخ الکرد القدیم ، اربیل ، ١٩٩٠
٤- ابن خلکان ، وفیات الاحیان وابناو الزمان ، ج ٧، دارمارد ، بیروت ، بدون طبعیة ، ٦٠٨– ٦٨١ هـ

٣- سەرچاوە فارسیەکان

١- عبد العظیم رظائی ، تاریخ دە هەزار سالە ایران ، چاپ هفتم ، تالیتان ١٣٧٥ چاپ و انتشارات : اقبال – مروی ، تهران ، خیابان جمهوری اسلامی ، ج٤
٢- مایکل کافتر ، عامل کردی درسیاست خارومیانە ، ترجمە علی کلرمی ، مرکز پراو هشهای علمی و مطالعات استراتذیك خارومیانە – تهران – ١٣٧٦

٣- کریس کوچرا ، جنبش ملی کرد ، ترجمه ابراهیم یونسی ، انتشارات نگاه – تهران ١٣٧٢

سەرچاوە گۆڤاریەکان

١- گۆڤاری سیاسەتی دەولی ، ژمارە ١٣ ، ساڵی ١٩٩٥
٢- گۆڤاری سیاسەتی دەولی ، ژمارە ١٧ ساڵی ١٩٩٦
٣- گۆڤاری سەنتەری برایەتی ، ژمارە ٧ ، ساڵی ١٩٩٨

سەرچاوەی ئەنتەرنێت

W . W . W . alay islam . com / history / B2 F3 . htm , p2

# مەولانا خالید نەقشبەندی

## بن وبنەچەی مەولانا خالید

کەیفی عزیز خالد

بن وبنەچەی مەولانا خالید بەم شێوەیە لە بابەت رشتەی باوك و باپیریـەوە هاتوە:

ناونیشان و ڕشتەی باوك وباپیری ئەم زاتە بەم جۆرەیە مەولانا خالید کوڕی ئەحمەدی موسینە و لەتیرەی جافی مکایەلیە(١)

لە بارەی دایکی مەولانا ناوی فاگیمەیە و لە ساداتی بیرخدریە (٢) بـەلاّم لـە سەرچاوەی تر دەلێ نـاوی بەچـەند جـۆر هـاتووە بـەلاّم لـە سـاداتی بیرخـدری شاهۆیە .(٣)

مکایلی تیرەیەکن لە هۆزی جافی کە لە نەتەوەی پیر میکائیلن کە مەشهورە بە پیر میکائیلی (شەش ئەنگوست) ،(٤)

شوێنی زستانەیان لە ناحیەی قەرداغ سەربە پارێزگای سلێمانی ئیستا بووە .بە هاوینانیش دەچون بۆ کوێستانە تایبەتیەکان خۆیان لە کوردسـتانی ئێـران بەلاّم ئیستا خانەنشین بوونە کوێستان و گەرمیان ناکەن .(٥)

(پیرمیکائیل) یەکێك بووە لە ئەولیا و صالحانی ڕۆژگار .ئەم زاتە لە نەوەی خەلیفەی سێ یەم (عیمان کوڕی عفان) ە و لە ساڵی ٧٣٨ك کۆچی کردوە بۆ ناوچەی (جوانرۆ)ی سەر بە پارێزگای (سنە) لە کوردستانی ئێران ،بۆ ڕێنمای کردنی موسوڵمانان لە گوندی (دەودان) کە گوندێکە لە نزیك چەمی سیروان لە ناوچەی قەرەداغ و سەنگاو .(٦)

**لە دایك بوونی :**

زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بە ساڵی (١١٩٣ك ،١٧٧٩ز) دەکەن لە بارەی ساڵی لە دایك بوونی چ سەرچاوەکانی سەردەمی خۆی چ تازە .(٧)

بەلاًم لە سەرچاوەی تردا هاتووە وەك پارێزەر (عباس العزاوی ) دەڵێ لە ساڵی (١١٩٠ك– ١٧٧٦ز) لە قەرەداغ کە پێنج میل لە سلێمانی دوورە لە دایك بووە .(٨)

و لە ڕۆڤاریش دا هاتووە دەڵی لە ماوەی نێوان (١٧٧٦– ١٧٧٩ز) لە دایك بووە .پێ دەچێ ئەوەی لەم بارەوە شێخ محمد ئەسعەد ساحیب زادەی برازای یاداشتی کردووە (٩)ی کانوونی دووەمی (١٧٧٩ز) لە هەموویان لەڕاستی یەوە نزیك بووبێ .(٩)

مەولانا لە قەرەداغ لە دایك بووە هەر لەو گوندە قورئانی ختم کردوە ،کتێبە وردەکانی وەك عەوامیلی جورجانی و تەسریفی زەنجانی و کتێبی تر تائەگاتە المحرری فیقهی شافیعی خوێندووە،تا وای لێ هات پێ بگات بتوانێت بژیت

دوور لەماڵ و کەس و کاری پاشان نێرەدراوە بۆ سلێمانی لەوێ لەیەکێك لە مزگەوتەکان بووە بە فەقێ و خەریکی خوێندن بووە .(١٠)

## خوێندن

لەکاتی خۆی فەقێ لە کوردستان بە ئازادی و ویستی خۆیان لەهەر شوێنێك ئارەزووی خۆیان بووایا وەلە لای هەر مەلایەك کە خۆیان دەیانویست لە لای ئەو دەیانخوێند . بەم جۆرە بە هەموو لایەکی کوردستان ئەگەڕان تەنانەت ئەگەر پێویست بووایا و ئارەزوشیان بوایە دەچوون بۆ وڵاتانی تر .بۆ تەواو کردنی خوێندن لە لای زانای پایە بەرز ئیجازەیان وەرئەگرت .و ئیجازە زانستەکەشیان رشتەی ناوی ئەو مامۆستایانەیان تێدا بوو کە زنجیرە ئیجازەکەیان ئەچووە سەر تا ئەگەیشتە حەزرەتی پێغەمبەر ( د.خ ) ،مەولانا خالیدیش وەك هەر فەقییەکی کاتی خوێ بەم دەستورە لە سەردەمی فەقییەتی دا گەڵێ مەدرەسەی دیوەو لە لای زۆرێك لە زانا پایە بەرزەکانی سەردەمی خوێ خوێندوە .

وەك لە کتێبی ( المجد التالد فی مناقب الشیخ خالد)ی (ابراهیم فصیح الحیدری) و( التعریف بمساجد السلیمانیه ومدارسها)ی (شیخ محمدی قزلجی) و(الشیخ معروف النودهی)ی شیخ محمدی خالد نوسراوە .(١١)

ـــ سید عبدالکریم بەرزەنجی مامۆستای مزگەوتی عبدالرحمن پاشا لە گەڕەکی سەر چیمەن لە سلێمانی .

ـــ سید عبدالرحیم برای سید عبدالکریم بەرزەنجی

ـــ شێخ عبدالله ی خربانی .(١٢)

ـــ مەلا ئیبراهیم بیارەیی .

ـــ مەلا جەلالەدینی خورماڵی .

ـــ مەلا محمود غەزای .

ـــ مەلا سالحی تەرەماری .

ـــ مەلا عبدالرحیم زیارەت .(١٣)

ـــ مەلا محمدی باڵەکی ،کەمەشهورە بە ئیبن ئادەم .(١٤)

ـــ شێخ محمدی قەیسی سنەی کە ئیجازەی لە خزمەتیدا وەرگرتووە .(١٥)

هەروها مەولانا لای ئەو مامۆستا پایە بەرزانە دا ئەم کتێبانەی خوێندون

ـــ شرح الشمس .

ـــ مگول .

ـــ حکمە .

ـــ کلام ،ئەم کتێبانەی لە سلێمانی ودەوروبەری خوێندوە .(١٦)

ـــ حاشیەی جەلالەدین دوانی لەسەر (تهژیب المنگق) .

ـــ علم حساب وهندسە وئوسترلاب وفەلەکیاتی خوێندندوە .

ـــ شەرحی (مختصر المنتهی) ی( اصول الفقە)ی خوێندووە .

## سەفەرەكانی مەولانا خالید نەقشەبەندی :

### حەج

مەولانا خالید بە هۆی ئەو پلە و پایە ئاینیەی كە هیبوو هەردەم یستویەتی خۆی لە مەجلیسی زانایانی شەرع نزیك بكاتەوە ،و بەهۆی ئەو زانست وشارەزاییەی كە هەیبو دوور كەوتۆتەوە لە دونیا پەرستی وحەزی لە دەوڵەمەندی نەبووە و بەردەوام پەیامی پیرۆزبایی ئیسلامی كردۆتە بالاترین سەرمایە بۆ ژیان وكۆمەڵگا .لەبەر ئەوەی لە پێناو ئەم پەیامە پیرۆزە و گەیشتن بە مەبەستەكان ئارەزووی بەجێ هێنانی فەرزی حەج و زیارەتی ئارامگای (پێغەمبەر)(د.خ) لە دڵیدا جێگیر ئەبێ وبریاری سەفەر ئەدا لە ساڵی ١٢٢٠ ك چووە بۆ حەج .(١٧)

لە سەرچاوەیەكی تر هاتووە دەڵی لە ساڵی١٢٢٥ ك لە ڕێگای موصل ودیاربكر و حەلەب و شام و فەلەستین ئەرواتە حەج .(١٨)

لەسەرچاوەیەكی تردا ئاماژە بە ساڵی ١٢٢٠ك دەكات و ودەڵی لە ڕێگای موصل و شامەوە بەرەو مەككە ئەروا . بەڵام لە شام لە لای شێخ مصگفی كوڕی محمدی كوردی و شێخ محمدی كەزبەری لا دەدا و ئیجازەی (علم الحدیپ)ی لێ وەردەگرێت .(١٩)

لە دواییدا دەكەوێتە ڕێ بۆ حەج پاش ئەوەی ئاداب و مەناسیكی حەج جێ بە جێ دەكات سەر لە زۆر شوێن دەدات لە ماوەی سەفەری حەجیدا گەلێ سوود لە زانا و پیاوچاكان دەبینێ ، هەروەها سەرچاوەكانیش باس لەوە دەكەن كە لەم سەفەرەیدا وتراوە(فتوحاتی تۆ لەم وڵاتەدا نی یە تێ ئەگەینێ كەوا لە هیندستانە ، وئیشارەتێكی بۆدی وەفتوحاتی تۆ لەوێ یە ). (٢٠)

بەشارەتی پێ درا لە لایەن هەندێك پیاوچاكان لە مەككە مەولانا بە ئاواتی خوێ دەگات لە بوونی ڕێنمۆیی تەواو كە پاك وتزكیەی دەكات و پەروەردەی دەكات و سودی پێ دەگەینێ و بەم جۆرە سودمەند بوو بەم بەشارەتەوە دوایی گەڕایەوە بۆ ولآتی خۆی لەسەر دەرس وتنەوەی بەردەوام بوو لە گەڕەكی پێشوی خوێ . (٢١)

## سەفەری بۆ هینستان ،دلهی

پاش گەڕانەوەی مەولانا لە حەج كە لە سلێمانی بووە ، خەریكی دەرس وتنەوە بووە لە هەمان گەڕەكی جاران .(٢٢) ، ڕۆژێ دەروێشێك خۆی كردۆتە بە مزگەوتی عبدالرحمن پاشا ، ئەم دەروێشە خەڵكی هیندستان بووە لە موریدەكانی قوتبی زەمان شاه عبدالله دیهلەوی (قدس سره) بووە ، ئەم دەروێشەش ناوی دەروێش محمد و لەقەبی میرزا ڕەحیمەلآ بووە ، پاش ئاشنا بوونی لەگەڵ مەولانا خالید قسە ئەكات و مەولانا هان ئەدا بڕواتە لای شێخ (عبدالله) دیهلەوی بۆ هیندستان كەوتنە ڕێ .(٢٣)

لەبەر ئەوە مەولانا بۆ ولآتی هیندستان بەڕێ دەكەوێت وسلیمانی بە جێ دەهێلێت لە ڕێگەی موكوریانەوە دەروا بۆ ئێران لە تاران دەبێ و لەوێ خەریكی گفت وگۆ كردن دەبێت ، بە تایبەتی لەگەڵ موجتەهدێكی ناودار كە ناوی میرزا ئیسماعیلی كاشی بووە ، دیدار و مونازەرەیەیەكی عیلمی توند دەست پێ دەكات و سەرنجام شێخ ئیسماعیلی كاشی بۆر ئەدا . (٢٤)

پاشان تاران بەجێ دێلێ و دەچی بۆ شاری بەستام و خەدقان و سەنان و ونیشابور ، لەوێ زیارەتی قەبری شێخ بایەزیدی بەستامی دەكا ، پاشان

دەروا بۆ شاری (گووس) لە خوراسان زیارەتی ئیمام رچا دەکات ، پاشان دەروا بۆ (جەم) زیارەتی شێخ ئەحمەدی نامیقی جامی دەکات پاشان دەڕوا بۆ (هەرات) لە ولآتی ئەفغان لەوێ چاوی بە زاناو عالیمیەکانی ئەم شارە دەکەوێ.(٢٥) لەوێ دەروا بۆ قەندەهار وکابول و(دار العلیمی) بیشاور ئینجا دەروا بۆ لاهود وەلەوێ چاوی بە خواناسی گەورە شێخ (پناوالله)ی خەلیفە و هاوڕێی شاهد عبدالله دیهلەوی دەکەوێ .(٢٦) پاشان دەروا بۆ دلهی بە خزمەت شێخ عبدالله دەگات وتەریقەتی نەقشەبەندی پێ دەدات وفێرە ئادابی تەریقەتی دەکات ، مەولانا دەست دەکات بە سلوك و ئادابی تەریقەت. بەم شێوەیە مەولانا بەردەوام لە بەرزبوونەوە دا ئەبێت ،مەقامی (فەناو بەقای)بۆ رێ ئەکەوێ و بە هەموو جۆرە ئیستحقاقی ئیجازەی ئەبێ وەکو لە هەندێ نامەی شاه عبدالله نوسراوە کە مەولانا دەگاتە ئەم پایەیە شێخ عبدالله بە ئیشارەتێکی روحانی لە لایەن حەزەراتی گەورە گەورانی ئەولیا و لە جەماعەتی نەقشەبەندی ئیجازەی ئەدا لە هەر پێنج تەریقەتە بەناو بانگەکان کە بریتین لە (نەقشەبەندی ــ قادری ــ سوهرەوەردی ــ کوبرەوی ــ چەشتی) هەروەها ئیزنی ئیرشادیشی ئەدا و رێگای ئەدا بۆ ئیجازە دانی حەدیث و تەفسیر و سوفی گەری و ئەحزاب و ئەوراد و ئەدعیە و غەیری ئەمانە(٢٧)

### گەڕانەوە بۆ کوردستان

پاش مانەوەی ساڵێك لە خزمەتی شاه عبدالله دیهلەوی ،تیایدا هەتا دیهلەوی دوای خۆی لە شوینیدا خەلیفەی بوو و داوای لێ کرد بۆ ئیرشاد و سلوك

بگەڕێتەوە ولاتی خۆی وسالّی( ١٢٢٦ك ــ ١٨١١ن) گەڕایەوە سلێمانی و گەورە پیاوانی بە باشترین شێوە پێشوازیان لیّ کرد .(٢٨)

مەولانا هیندستانی جیهێشت بە ڕێگای بەندەری (مەسقەت) و لەوێ وە بۆ شیراز و هەمەدان ولە هەموو شوێنی دەست بە ئامۆژگاری خەلّك دەكات و ڕاستیان بۆ ڕوون دەكاتەوە ، پاشان دەڕوا بۆ سنە وەچەند ڕۆژێك لەوێ دەمێنێتەوە و باسی مالّی خۆی دەكات و موسلّمانان بانگ دەكات بۆ ڕێبازی نەقشەبەندی . زانای گەورە شێخ قەمیمی مەردۆخی كە كاتی خۆی مامۆستای مەولانا بووە و خۆی دەبیّ بە موریدی مەولانا لە سەر دەستیدا تەریقەت وەردەگرێت .(٢٩) ، پاشان بۆ سلێمانی دەگەڕێتەوە پاش ماوەیەك لە سلێمانی دەمێنێتەوە بەبێ ئاماژەیەكی (پیرەكەی) شێخ عبدالله دلهەوی ڕووی كردۆتە شاری بەغدا و لە گۆشەی ( تەكیەت غەوس ــــ شێخ عبدالقادر گەیلانی) دا حەواوەتەوە دەستی بە تەریقەت بلاّو كردنەوە كردووە ، دوای پێنج مانگ حەوانەوە و لە كۆتایی سالّی (١٢٢٦ك ــــ ١١٨١ن) گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و خەریكی ڕێباز و كاری زانستی بووە .(٣٠)

لە كاتی گەڕانەوەی بۆ سلێمانی دووبارە دەستی كرد بە بلاّوكردنەوەی تەریقەت لەم كات وساتەدا (فەقیّ عیمان) كە بە ناوبانگ بووە تەمەسوك دەكا ، بە جۆرێك لە تەمەسوك و تەریقەتدا ناوبانگی مەولانا تا ئەو پەر دەڕوا میر و پاشا دەبنە موریدی وناوبانگی بە هەموو لایەكدا بلاّو دەبێتەوە ،لە بەر ئەوەی ئەوانەی ئەمەیان لە قازانج بۆ ناكەوێتەوە دەبن بە ناحەزی و قسە و بوختانی لە دژ بلاّو دەكەنەوە ئەمەش بە جۆرێك تەشەنە دەكات كە دەگا بە فەرمان ڕەوای هەرچەندە مەولانا نەرمی پیشان دەدا، بەلّكو بگەڕێنەوە سەر ڕێگای

چاکە بەڵام هیچ سود بەخش نابێت ،ناچار بۆ کوژاندنـەوەی ئـاگری فیتنـە بـە تایبەتی لەو ڕۆژگارەدا کە لـە ناوچـەی بابـان پـڕ بـووە بـەهۆی هـەوای نێـوان خالید پاشای کوڕی ئەحمەد پاشا و عبدالرحمن پاشای کوڕی محمـود پاشـای گەورە ، مەولانا بڕیار ئەدا لە سلێمانی نەمێنێتەوە تا ئەم ناکۆکیە نەبێتە هۆی بەڵاو موسیبەت بۆ موسڵمانان و نیازی سەفەری بەغدا ئەکا .(٣١)

سـاڵی ١٢٢٨ك مـەولانا سـلێمانی بـە جـێ دێڵـێ ، لەسـەردەمی ویلایـەتی سەعید پادشای کوڕی سلێمان پادشای گەورە گەیشتە بغداد لـە مەدرەسـەی (احسائیە) دادەنیشی کـە ئێـستا پـێ دەڵـێن تەکیـەی خالیـدی بـە گەیـشتن و دامەزراندنی مـەولانا لـە شـاری بەغـدا زانایـان و پیـاو چـاکان وڵات لـە هـەموو لایەکەوە ڕووی تێ دەکەن تاکو چ تەریقەتی لێ وەرگرت و چ سود وەربگرن لـە (زانـست)ی زاهـیری و بـاتینی لای مـەولانا ، لـەم کـات وسـاتە دا گـەلێ مـەلای گەورەی عەرەب وتورك وکورد هاتوون ،لەلای بـوون وخۆیـان داخلـی تەریقـەت بوون .(٣٢)

## گەڕنەوە بۆ سلێمانی :

بەهۆی یەکلابوونـەوەو گـۆڕانی بـارودۆخی سـلێمانی کـە ئـەم کاتـە محمـود پاشای کوڕی عبدالرحمانی پاشـا بـوو بـە فەرمانـداری وڵاتـی بابـان .هـەروەها نێوانی لەگەڵ بەغدا باش بووە ،محمود پاشا هاتووە بۆ بەغدا و لەوێ چاوی بە موریـد و خـەڵك دەکـەوێت داواو تکـای لێکـرد کـە بگەڕێتـەوە بـۆ سـلێمانی ، هەرچۆن بێ مەولانا هاتەوە بۆ سلێمانی وە محمود پادشا بەراستی خزمەتێکی

زۆری کرد وئەم خانەقا گەورەی کە ئیستا هەیە لە سلێمانی بە ناوی مەولاناوە دروستی کردوە .(٣٣)

مەولانا لەم خانەقایە ئەحسێتەوە و پادشا هەندی مولّکی باشیشی وەك گوندی (کەمالان) وچەند گوندێکی تر لەسەر خانەقا وەقف دەکات بۆ بەخێو کردنی هەژاران ودانیشتوان .(٣٤)

ئەو کاتە گەلێ لە زاناو عالیمان لە ولاتانی تر ڕووی تێ دەکەن بۆ تەریقەت وەرگرتن و لە ماوەیەکی کەمدا زۆر بە نوری دەرونی شاد ئەبن ، ئەمە جگە لەوەی دەرسی زانستی ئایینی گوتۆتەوە، ئەم جارە نزیکەی شەش سالّ لە سلێمانی مایەوە . (٣٥)

**بەغدا - هەورەمان :-**

پاش ئەوەندە سالّەی لە سلێمانی مایەوە ، مەولانا دوای ئەوەی بارودۆخی خۆی و موریدەکانی هەلّدەسەنگینی سەرنج دەدا ئەمەی پێ باش نابێ بە تایبەتی شەڕو ئاژاوەی زۆر لە ناو بابانەکان خویاندا هەر بەردەوام بووە . ئیتر بە جارێك دلّی لە سلێمانی ودانیشتن لە سلێمانی بێزار دەبێت لە بەیانی ٢٥ــ١٠ــ ١٨٢٠ك کە ڕێکەوتی ١٢٣٦ك سەفەری کردووە لەگەلّ حەرەمەکانی ڕێگای بەغدا ئەگرێتە بەر و مالّ و موریدەکانی لە سلێمانی بە جێ دەهێلّێ وشێخ عبداللە هەراتی ئەکا بە جێنشینی خۆی .(٣٦)

لە سەرچاوەی تر ئامارە بەم سەفەرە دەکات ودەلّێ (نیشتە جێ بوونی مەولانا لە سلێمانی ئەوەندەی نەخایاند چونکە لە ناکاو لە بار و دۆخێك دا کە

بە ڕاستی ڕوون نی یە سلێمانی بە جێهێشت و ئیتر نەگەڕایەوە ئەم شارە).
(٣٧)

لە سەرچاوەیەکی تردا ئاماژە بەوە دەکات دەڵی لەبەر زۆر بوونی ژمارەی مورید و دەروێشەکانی بووە مایەی تووڕە بوونی قادرییەکان و لایەنگرانیان لە مەولانا خالید لە لایەن قادریەکان ولایەنگرانی تا وای لێهات کە گومانی کوشتن و لە ناوبردنی بکەن .(٣٨)

بۆ جاری دواییش ریچ باسی سەفەری مەولانا دەکات و دەڵێت ( ئەم بەیانیە شێخ خالیدی بەناو بانگ هەلآت لەگەڵ ئەوەش کە ڕۆیشتنەکەی بە نهێنی بوو توانی هەر چوار ژنەکەی خۆی لەگەڵ خۆی ببات بەڵام هێشتا نەزانراوە بەرەو کوێ ڕۆیشتوە ،چەند ڕۆژێك لەمەوبەر کوردەکان لە پلەیەکی بەرز تر لە پلەی عبدالقادر دایان دەنا پاشا عادەتی وابوو لەبەردەمی ئەوەستا قەلیانەی بۆتێ دەکرد کەچی ئەمڕۆ پێ ی دەڵێن کافر و داستانی زۆر لە بارەی فیز و کافری و زەندیقی یەوە ئەگێڕنەوە ،ئینجا لە بارەی هەلآتنەکەی قسەی جۆراوجۆر هەیە هەندێك دەڵێن دەستی کردبوو بە ئاژاوە نانەوەی لە نێوان پاشا و براکانیدا کە ویستویانە لای پادشا لەگەڵی ڕوو بە ڕوو ببنەوە ، هەندێکی تر دەڵێن دەستی کرد بوو بە دانانی مەزەبێکی نوێ کە دەیویست بناغەی بۆ دابنێت و دەیویست خۆی بکات بە گەورەی دنیایی وڵاتەکەی .

بێگومان زۆر شت لە بارەیەوە گوتراوە و شتی زۆ لەوە زیاتری دراوەتە پاڵ کە لە ڕاستیدا پشتی بدرێتە پاڵی مەلاکان وسەیدەکان لە سەرووی هەموشیان شێخ مارف هەمویان رقیان لە شێخ خالیدە کە کاتی خۆی دەسەلآتی بەدەستەوە بوو هەموویانی بەزاندبوو .(٣٩)

ریچ باسی هۆکارێکی تریش دەکات دەڵێت ڕۆیشتنی مەولانا لەبەر ئەوە بوو (پاشا توڕە بووە کە مەولانا خالید کەرامەتی نەبووە و دەستە پاچە بووە بەرامبەر بە نەخۆشی یە کوشندەکەی کوڕەکەی ).(٤٠)

پاشان لەبەغدا دەچێتە هەمان تەکیەی جارانی تەکیەی (الخالدیە) گەلێ لە زانایان لە دەرەوە کۆ دەبنەوە والی بەغدا داود پاشا خزمەتێکی زۆری کردووە وتەکیەی بۆ ئاوەدان دەکاتەوە ، جا لەم ڕووەوە دیارە بۆ زۆر بوونی ڕێبوارانی ڕێ ی حەقیقەت لە کوردستان هەموو ساڵێك هاوینان بەغدای جێ ی هێشتووە و هاتۆتەوە هەورامان لەوێ هەوارێکی هەبووە بەم شێوەیە ساڵانی (١٢٣٦ ــ١٢٣٧ ــ ١٢٣٨)ی رابردوە و بەڵام کاتی نامەو داخوازی بۆ دێت لە لایەن خەڵکی شام لە سەر داوای ئەوان ڕوو دەکاتە شام و بڕیار دەدا بچێتە ئەوێ .

لە ساڵی ١٢٣٨ ك مەولانا گەیشتە شام .(٤١)

## سەفەری شام :

هەر بە هاتنی مەولانا بۆ شام ، زانا و ئەدیبان و پیاوە گەورەکان و پیاو ماقوڵان و کار بە دەستانی دەوڵەت خەڵکی تریش پێشوازیەکی شایستەیان لێ کردوە و بگرە ئەدیبان بە پارچە شیعر و قەسیدەی جوان و غەزەل ستایشی لە بارەیەوە دەنووسن .(٤٢)

پاش ئەوەی مەولانا بە یەکجاری لە شام دادمەزرێ و لەوێ دا بە نامە و هەواڵ ئاگاداری زۆربەی خەلیفەکانی دەبێ لە هەڵوێستەکان ئاگاداریان دەکاتەوە و هەروەها لە شام خەریکی تەریقەت دان دەبێت . لە دیمەشق

خەڵکی ئەوێ خۆشیان ویستووە زۆربەی زاناکان هاتوونەتە ڕێزی تەریقەت ، یەکیان موفتیەکانی شیخ حسینی مرادی ، لەوێدا شێخ خالید خەلیفەکانی بەسەر مزگەوتەکانی دیمەشق دابەش کرد کە تیایدا سەڵەوات بۆ تەوراد و زیکری لێ ئەنجام دەدا .

ـ مزگەوتی (العداس) لە لایەن شێخ ئیسماعیل هەکارانی .

ـ مزگەوتی (المعلق) و(السیاغوشیە) لە لایەن شێخ خەتیب هەولێری .

ـ مزگەوتی (المرادیە) ئیستا بە مزگەوتی (السویقە) ناسراوە لە لای مەیدان ، لە لایەن شێخ محمد خانیەوە بە ڕێوە بردراوە .

ـ مزگەوتی (الصاحبە) لە (الصالحیە) لە لایەن شێخ عبدالقادر دیملانیەوە . (٤٣)

دوای دامەزراندنی بە تەواوی لە شام زیارەتی قودس دەکات و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ شام تا ساڵی ١٢٤١ ك لەوێ خەریکی ئامۆژگاری کردنی موسوڵمانان ودەرس وتنەوە دەبێت لە ساڵی ١٢٤١ ك لەوێ لەویچ خەریکی ئامۆژگاری کردنی موسڵمانان بووە زیارەتی مەدینەی منەوەرە و ئارامگەی ( حەزرەتی پێغەمبەر) (د . خ) دەکات و لەوێشەوە بۆ حەج ، پاش بەجێ هینانی ئادابی زیارەت وپێویستیەکانی دەگەڕێتەوە بۆ شام . (٤٤)

## مەرگ و وەسیەت :

ساڵێك پاش گەڕانەوەی لە سەفەری حەج لە شامدا نەخۆشی تاعون بڵاو دەبێتەوە ، ئەوکات مەولانا خەریکی بڵاوکردنەوەی شەریعەت و تەریقەت بووە

، لەبەر ئەوەی مەولانا نەخۆش دەبێت و تاعون دەیگرێتەوە ، دوای ئەو هەموو ژیانە پڕ لە ئازارەوە و دەردەسەریە لە شەوی هەینی ١٤/١٣ ذولقەعدە ١٢٤٢ ك – ٧ – ٦ – ١٨٢٧ ز مەولانا لە ژیان دەرچووە و لە چیای قاسیۆن (تەل ئەلنور) نێژراوە .(٤٥)

لە سەرچاوەی تر ئاماژە بە کۆچی دوایی مەولانا کراوە و دەڵی :ـــ (لە شەوی هەینی ٢٨ی شەوال ١٢٤٦ ك بە نەخۆشی تاعون لە شام کۆچی دوایی کرد) .(٤٦)

دوای ئەوەی لە لایەن گەورە پیاوان و زانا و عالیمانی شام ڕێ ورەسمی ناشتنی کراوە ، مەولانا لە دوای خۆی وەسیەتی کردووە کە شێخ ئیسماعیل هەنارانی خەلیفەی بووە و لە تەکیەی دانیشتووە . شێخ ئیسماعیل دوای ٢٤ ڕۆژ گرفتاری تاعون دەبێت وکۆچی دوایی دەکات ، شێخ ئیسماعیل کە بە نەخۆشی ئەکەوێ زوو نامە ئەنوسێ بە دوای شێخ عبدالله هەراتی دا کە ئەو کات لە سلێمانی بووە بۆ ئەوەی بێت بۆ شام و لە تەکیەی دائەنیشێ و دەست دەکات بە ڕێ نیشاندانی موسوڵمانان و خزمەتی خێزانی مەولانا . (٤٧)

**تەوەرەی دووەم :**

**- پایەی مەولانا خالید لە ڕێبازی نەقشەبەندی دا .**

**- خەلیفەکانی مەولانا خالید .**

**- مەنسوبەکانی مەولانا .**

## پایەی مەولانا خالید لە ڕێبازی نەقشەبەندی دا :

مەولانا خالید کە لە ساڵی (١١٩٠ ك ـــ ١٧٧٩ ز ) لە دایك بووە ، لە ساڵی ١٢٢٤ ك دا لە ڕێگای حەجەوە بۆ هیندستان و لە شاری دەلهی لە لای شاە عبداللە تەریقەتی نەقشەبەندی وەرگرتووە لە ساڵی (١٢٢٦ك ) دا گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی . لەگەڵ گەڕاندنەوەی دا دەستی کردووە بە بڵاوکردنەوەی ڕێبازەکەی و موریدی زۆری لێ کۆبۆتەوە ، ئاماری مورید و لایەنگیرانی گەیشتۆتە (١٢) هەزار مرید و (٣٤) خەلیفەی کورد و (٣٣) خەلیفەی سەر بە نەتەوەکانی تر .(٤٨)

مەولانا خالید لە ساڵی ١٢٢٦ ك گەڕایەوە بۆ سلێمانی پیاو ماقوڵانی شارەکە بە شێوەیەکی بەرز پێشوازیان لێ کرد و پایە و شوێنێکی گەورە لە لای دانیشتوان بۆ دروست بووە .(٤٩) کاتێك کە مەولانا خالید گەڕاوە بۆ سلێمانی دەستی کردووە بە بڵاو کردنەوەی ڕێبازی نەقشەبەندی لە لایەن بابانەکانەوە لەقەبی سەرۆکی زانایانی پێ دراوە .(٥٠)

مەولانا دوای گەڕانەوەی بۆ سلێمانی لە ماوەیەکی کورت دا ناو و ناوبانگی نەك سنووری میرنشینی بابان بەڵکو ( بەغدا و شام و ئەستەمبول) یش دەگریتەوە لە هەموو لایەك خەڵك ڕووی تیَ دەکەن بۆ تەریقەت و ئیرشاد .

بۆیە هەر لە ماوەیەکی کورت توانی جێگای خۆی لە ناو دڵ و دەروونی هەزارەها ڕێبواران بکاتەوە و چوارچێوەی سنووری تەسکی سلێمانی بپچڕێنی ( لە نیوەی یەکەمی سەدەی سیانزەمی کۆچی مەولانا خالیدی نەقشەبەندی کە بە نویَ کەرەوەی ئەو سەدەیە دائەنرێت پەیدا بوو بە نوری عیرفانی هەموو عێراق و حیجاز و یەمەن و سوریا و فەلەستین و میسر و ئێران و ئەفغانستان و بەشێکی زۆری ئاسیای بچوکی ڕووناك کردەوە تەریقەتەکەی بلاْوکردەوە (٥١).

هەر لە بارەی پلە و پایەی مەولانا خالید پلەو پایەی بەرزی هەبوو لە نێو خەڵك هەندێك جار لە لایەن میرانی بابانیش ئەوپەڕی ڕێزی لیَ گیراوە ، وەك ریچ لە گەشتەکەی باسی دەکات دەڵیَ سلێمانی سۆفیەکی گەورەی لیَ یە ، ناوی شێخ خالیدە کوردەکان پییان وایە ئەگەر لە حەزرەتی مەولانا کەمتری پیَ بوتریَ نەنگیە و وتەکانیشی بە فەرموودە دادەنێن ، لە خێڵی جاف ولەسەر تەریقەی نەقشەبەندیە لە دەلهی لە سەر دەستی سۆفی بە ناوبانگ (سولتان عبداللە) دا بۆتە سۆفی بە سەرانسەری تورکیا و ولاْتە عەرەبەکاندا (١٢) هەزار موریدی هەیە کوردەکان هەموویان بە (وەلی) دەزانن ، زۆری تریشیان لە ڕێزەی پێغەمبەرەکەیاندا دایدەنێن ، عیمان یەك پیَ ی وتم : خۆیَ و مەحمود پاشا زۆربەی سەرانی کورد موریدی ئەون ، چونکە بە لای کەمەوە لەگەڵ (شێخ عبدالقادری بە ناوبانگ) لەیەك پلە دان .(٥٢)

هەر لە بارەی پایەی مەولانا لە لایەن میرانی بابان وەك ریچ باس دەكات دەڵێ لە ژیانی میرنشینەكەشدا بۆ زۆر كاروباری گرنگ هەر پرس و ڕاوێژ و سوێند خواردان كە خیانەت لە یەكتری نەكەن ، لای مەولانا خالید دەبرێندرێتەوە .(٥٣)

ڕێبازی نەقشەبەندی سەرباری بڵاوبونەوەی لە هەردوو میرنشینەكە و لە دەرەوەی سنوری ئەوانیشدا بەڵام نەبۆتە ڕێبازی سەر بە دەسەڵاتی ئەم دوو میرنشینە ، بەڵكو ناكۆكیشی هەبووە لەگەڵیاندا بە تایبەتی لەگەڵ دەسەڵاتی بابان و ڕێبازی تەسەوفی میرنشینی باباندا كە ڕێبازی قادری بووە ، بێگومان ئەو ناكۆكیە لەگەڵ ناوەندی دەسەڵاتی بابان و ڕێبازی قادری دا لە بارێكی تردا ناراستەوخۆ بۆتە ناكۆكیان بەلای كەمەوە نەگونجاندن لەگەڵ دەسەڵاتی عوسمانی دا . دەشێ یەكێك لە هۆكارەكانی بڵاوبوونەوەی ڕێبازی نەقشەبەندی لە سنوری دەوڵەتی عوسمتانی دا لە ماوەیەكی كورت دا پەیوەندی بەوەوە هەبێت كە ڕێبازی نەقشەبەندی لە بەرامبەر دەسەڵاتی عوسمانیەكاندا وەكو ئایدیا دەردەكەوێت .

بێگومان گەندەڵی دەسەڵاتی عوسمانیەكان بێزار بوونی خەڵكی لێیان بە تایبەتی خەڵكانی ناودار و خاوەن پلە و پایەی كۆمەڵایەتی و ئاینی هۆیەكی ئاشكرا بووە بۆ ئەوەی ڕێبازی نەقشەبەندی وەربگرن پەرە پێ بدەن تەنانەت عوسمانیەكان هەستیان بە مەترسی دەسەڵات و نفوزی مەولانا و ڕێبازەكەی كردووە ، شێخ ڕۆوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەكانیدا دەربارەی ئەوە دەڵێت دكتۆر علی ابو نوار لە كتێبی (داود پاشا) یدا لە باسی مەولانا گوتویەتی : مەولانا لەو سەردەمە ناوبانگی زۆر بڵاو بۆتەوە لەناو خەڵكیدا . حكومەتی

عوسمانی لەوە ئەترسا کە مەولانا مەزهەبێکی تایبەت لە کوردستاندا دابمەزرێنیٚ و بلاٚوی بکاتەوە وەکو ئەو مەزهەبەی وەهابیەکان کە ئەویش مەترسی هەبێت بۆ بەرژەوەندی عوسمانیەکان لە کوردستاندا .(٥٤)

ئەمەش لە لایەك پایەی مەولانا خالید و ڕێبازەکەی نیشان ئەدات لە لایەکی ترەوە شوێنی مەولانا و ڕێبازەکەی ئاشکرا دەکات لە ڕوانگەی دوانینی دەسەلاٚتی عوسمانیەکانەوە کە لە ڕوانگەی ترسەوە لێیان ڕوانیوە هەموو ئەمانەش پایەی بەرز و نفوزی زۆر بەربلاٚوی مەولانا نیشان ئەدات .

بەهەر حالٚ لەمێژووی ئیمەدا کەسایەتێکی پایە بەرزە و دەبێت وەکو یەکێك لە ڕەمزەکانی مێژووی کور سەیری بکەین .

## خەلیفەکانی مەولانا خالید :

نەك هەر سەرچاوەیەك بگرە وەك باسێکی سەربەخۆ و هەروەها لە زۆربەی کتێبە تایبەتیەکان بەشێك لەبارەی خەلیفەکانیەوە تەرخان کراوە ، ئەوەتا (عباس العزاوی) پارێزەر بەجودا و سەربەخۆ و بە وردی لەبابەت خەلیفەکانی مەولانا دواوە ، بگرە لە کتێبەکانی کە ئەگەر مێژووی بن و تیایدا لەسەر مەولانا خالیدەوە دوابیٚ ، ئەوا باسی کردووە لە گرنگی دواوە ، لە ژێر سەردێری (خلفاو مەولانا خالد) عباس العزاوی پارێزەر باس لە خەلیفەکانی مەولانا دەکات ، ئەمەش بابەتێکی دیکەیە بەرلەوە لە مەولانا و شاری سلێمانی بە ناوی شهرزور دواوە ، تیایدا باس لە بەرهەم و سالٚی ئیجازە نامە و نەوەکان و تەکیەکان دەکات . هەروەها لە گەلیٚ کتێب باس لە خەلیفەکانی مەولانا کراوە ، وەك یادی مەردان هەروەها (الگریقە النقشبندیە واعلامها) و

هـەروەها (صـفی المـوارد فی احـوال الامـام خالـد) و گـەلێکی تـر بـاس لـە خەلیفەکانی مەولانا کراوە . (٥٥)

هەروەها دەتوانین بڵێین مەولانا جگە لە کوردستان لە زۆر وڵاتی تر خەلیفـە و موریـد و مەنـسوبی هـەبووە . خەلیفـەکانی مـەولانا لـە تورکیـا و سـوریا و فەلەستین وعێراق وچـەند ناوچـەیەکی تـر هـەبوون ژمـارەی خەلیفـەی کـوردی (٣٤) خەلیفە وەی بێگانە (٣٣) خەلیفە بوون .(٥٦)

سەرچاوە کۆنەکان وتازەکان بەسەدان هەزار خەلیفە و موریدیان ژمـاردوە ، ئێمـە لێـرە بـە پـێ ی ئـەو سەرچـاوانەی لەبـەر دەسـتمان دان نـاوی چـەند خەلیفەیەکی کوردی و عەرەبی و دەنوسین و هەندێك لە مەنسوبەکانیش .

## خەلیفە کوردەکان :

١- شێخ عیمان سراج الدین .

٢- مەلا موستەفای کوڕی مەلا جەلالی خورماڵی .

٣- سەید ئەحمەدی مەشهور بە سەرداری خەڵکی سەرگەلوت.

٤- شێخ عبدالقادر بەرزەنجی سەرگەلو .

٥- شێخ مەحمودی ساحیبی برای باوك دایکی خۆی .

٦- شێخ ئیسماعیلی بەرزەنجەی کۆنە کۆتری .

٧- شێخ ئیسماعیلی هەنادانی .

٨- حاجی مەلا عبدالله ی جەلی .

٩- شێخ مەلا عباس کۆی .

١٠- شێخ مەلا مەحەمەدی قزلەری.

١١- مەلا عبدالفەقۆی کەرکوکی.

١٢- شێخ مەلا بەکری کوردی گەلاڵی .

١٣- شێخ مەلا هیدایەتولای هەولێری .

١٤- شێخ ئەحمەدی خەتبی هەولێری .

١٥- شێخ عبدالفتاحی عەقرەیی .

١٦- شێخ ئیسماعیلی شێروانی .

١٧- شێخ مەحەمەدی حافقی ئۆرفەلی .

١٨- شێخ مەلا مەحەمەدی مەجزوب .

١٩- سەید تەهای نەهری .

٢٠- شێخ عبداللە مامی سەید تەهای شەمزینی .

٢١- شێخ خالید حەریری .

٢٢- شێخ مەحەمەد قیرانی .

٢٣- شێخ تاهیری عەقرەی بامەرنێ .

٢٤- مەلا ئەحمەد کۆلاسارەیی .

٢٥- مەلا ڕەسولی سابلاغی .

٢٦- سەید عبداللە ی حەیدەری .

٢٧- شێخ عومەری قەرەداغی مەشهور بە شێخ هۆمەر .

٢٨- شێخ مەسعودی ئامێدی .

٢٩- شێخ مەحمودی کوڕی عومەری سوسنی .

٣٠- مەلا ئەحمەدی هەکاری .

٣١- شێخ مەحەمەدی قەرمەشلی.

٣٢- شێخ مەلا خالید .

٣٣- شێخ خالیدی کوردی .

٣٤- شێخ مەلا عبدالرحمن ی کوردی .

٣٥- شێخ عبالسلامی بارزانی .

## خەلیفە غەیرە کوردەکان :-

١- شێخ عبداللە ی ئەفغانی هەراتی .

٢- سید عبدالغفور مەشاهیدی بغدادی.

٣- شێخ محمد واجدیدی بغدادی.

٤- شێخ موسای جبوری .

٥- شێخ محمدی ئیمام .

٦- مەلا ئەبو بەکر بەغدادی .

٧- شێخ ئیسماعیل بصری .

٨- شێخ محمد ناصح .

٩- شێخ ئیسماعیلی غەززی.

١٠-شێخ معروفی تکریتی .

١١- شێخ عبالقادر دیمەلانی .

١٢- شێخ موسای بەندەنیجی .

١٣- سید محمود ئەفەندی گەیلانی .

١٤- شێخ محمد خانی .

١٥- شێخ ئەحمەدی سەمین .

١٦- شێخ حوسنی پۆزانی .

١٧- شێخ عبدالله فەرد .

١٨- شێخ عیسای بەندەنیجی .

١٩- شێخ محمدی کوڕی سلیمانی تەرابلوسی .

٢٠- شێخ محمد کوڕی سلیمان .

٢١- شێخ محمد صالح .

٢٢- شێخ عبدالله ی ئەرزەنجانی .

٢٣- شێخ محمدی عاشقی میسری .

٢٤- شێخ یوسفی ئیسلام بولی .

٢٥- شێخ فەیزوڵای ئەرزەرۆمی .

٢٦- شێخ ئەحمەد ئاگرە بۆزی .

٢٧- شێخ عەلی بالولی .

٢٨- خواجە عمر راسیم ئەفەندی .

٢٩- شێخ ئەحمەد قوستەمونی .

٣٠- شێخ حسین ئەفەندی .

٣١- شیخ جودت ئیبراهیم .

٣٢- شێخ محمد هەراتی .

٣٣- سەید ئەحمەد زیائودوینی گومەشخانی .

٣٤- عبیدالله ی کوڕی عبیدالله ی کوڕی سیبغەتولای بەسرا ١٢٢٨ك ١٨١٢ ز.

٣٥– ئەسعەد حەیدەری .موفتی حەنەفی لە بەغدا.

٣٦– ئیسماعیل شەروانی داغستانی .(٥٧)

## مەنسوبەکانی مەولانا خالید:-

مەولانا سەرەرای خەلیفە و لایەنگرانی و کەسانی تر کە زانیاریان پێ هەبووە دیارە وەك ئەو هەموو خەلیفەی هەبووە . کۆمەڵێك مەنسوبی هەبوە ،کە بێگومان دیارە ژمارەیان زۆر لە ژمارەی خەلیفەکانی زیاتر بووە .(٥٨)

وەك سەرچاوەکان باسی لێوە دەکەن لەوانە بە مەولانا معجیب بوون و لە زانایانی ئەو تێنویشیان شکاندوە ، بەهەرحاڵ ئەمانە ناوی هەندێك لە مەنسوبەکانی کورد و عەرەبن :–

١. شێخ یحیای مزوری .
٢. مەلا محمدی سەلیمی کوڕی مەلا یەحیا .
٣. مەلا ئەبو بکری کوچك مەلا باپیری مەلا ئەفەندی هەولێری .
٤. مەلا عبداللە ی ئامێدی .
٥. مەلا مستەفای هەولێری .
٦. سەید عبدالقادر بەرزەنجی مودەریس.
٧. سەید عبدالعزیز بەرزەنجی برای نەقیبی سلێمان.
٨. مەلا شێخ محمدی ڕۆژبەیانی .
٩. مەلا حسین پشدەری .
١٠. مەلا عومەری عەسکەری .

١١. مەلا عبدالكریم كوڕی شێخ عومەری مودەریس مزگەوتی گەورەی سلێمانی

١٢. داود پاشای والی بەغدا .

١٣. سەید عباللە ی داغستانی .

١٤. سەید مەحمەد كوڕی سلێمانی بەغدادی .

١٥. نەجیب پاشای والی شام .

١٦. سەید عبدالرزاق حەیدەری .

١٧. شێخ ئەبو الخیری دیار بەكری .

١٨. سەید محمد تاهیر ئەفەندی حسینی موفتی قودس .

١٩. سەید خەلیلی سەمین نەقیبی ئەشراف تەرابلوس شام .

٢٠. شێخ عومەری موجتەهیدی دیمەشقی .

٢١. سەید شێخ محمدی تەبە قجەلی .

٢٢. عبداللە پاشای والی عەككا .

**تەوەرەی سێ یەم :**

- **بلاو بونەوەی تەریقەت .**
- **هەڵوێستی بابانەکان .**
- **هەڵوێستی دەوڵەتی عەسمانی .**

- **بلاوبونەوەی تەریقەت :**

سالانی ١٨١١-١٨٢٠ ز بە پڕ بەرهەمترین ڕۆژانی ئەم ڕێبازە لە کوردستان دەژمێردرێن . ئەم ڕێبازە پشتیوانیەکی جەماوەری مایەی سەرسامی هەموو لێکۆلیارێکی مێژووی ئەم ولاتە بە دەست هێنا . سەبارەت ئەوەی کە بەردەوام ڕووبەڕووی دوژمنایەتی قەدەریەکان و ناوبەناو دوژمنایەتی میرانی بابان دەبووەوە . ژمارەیەکی زۆری خەڵك بە گەڕانەوەی مەولانا لە ساڵی ١٨١١ دا بۆ سلێمانی هاتنە سەر ڕێبازەکەی بە تایبەت ئەو توێژە بازاریە ی کە هەلو مەرجی پڕ شەڕو شۆڕی میرنشین زیانی لە بەرژەوەندیەکان ئەدا .ئەوانەی بێ پەردە دوژمنایەتی ئەو دەربەگانەیان دەکرد . بۆیە خەڵکەکە وەك بانگەوازێکی رزگارکەر بە پیریەوە چوون و پێشوازیان لە مەولانا کردوە بە تایبەتیش چینی جوتیاران و توێژی بازاری ، کە شەڕی خوێناوی بەردەوامی ناوچەکە ژیانی لێ شێواندوون وزیانی لە بەرژەوەندی و سەر و ماڵیان داوە .(٥٩)

بۆیە ڕێبازە تازەکە چوارچێوەیەکی وای بۆ ئەوان پێکهێنا کە گوزارشتی لەبەرژەوەندی هاوبەشیان کرد ، لەبەر ئەوە لە سەرەتاوە بە توندی

پشتگیریان کرد ، ئەمجا خەڵك بە کۆمەڵ هاتنە سەر تەریقەتەکە ، لە کاتێکدا بڵاو بونەوەشی بە تەنها لە کوردستاندا نەگیرساوە بەڵکو خەلیفەکانی مەولانا بە تورکیا و سوریا و فەلەستین و عیراق و داغستان و چەند ناوچەیەکی دیکەدا بڵاوبوونەوە، ژمارەی خەلیفەکانی کورد لە (٣٤) خەلیفە و هی بێگانەکانیش (٣٣) خەلیفە ئەدا .(٦٠)

بە قسەی ریچ ساڵی ١٨٢٠ (١٢) هەزار موریدی لە وڵاتانی عەرەب و تورکیا و سەربە تەریقەتەکەی لە هەموو وڵاتاندا بە (٢٠) هەزار کەس داناوە.(٦١)

ئەمە ژمارەیەکی گەورەیە ئەگەر لەگەڵ ژمارەی موریدانی ئەو ڕێبازە سۆفیانەی دیکەدا بەراورد بکەین کە چەندین سەدە لە وڵاتە موسڵمانەکاندا هەڵیان کردبوو . ئەو موریدانەش کە رێ و ڕسمی زیکر و خواپاراستنیان بە پێ ی ڕێبازی نەقشەبەندی بەجێ نەدەهێنا بەڵام وا خۆیان دەردەخست کە سەر بە ڕێبازەکە و شێخەکەین دەخرێنە پاڵ ئەوانە کە ئەو ڕێ و ڕەسمەیان بە جێ دەهێنا ، ژمارەی ئەوانیش وەك دەردەکەوێت کەم نەبوو .

دەست رۆیی مەولانا لە ناو کوردا گەیشتە ئاستێك کە بە عبدالقادری گەیلانیان دەچواند و قسەکانیان بە فەرموودەی پێغەمبەران یان بە خاوەن سەرچاوەیەکی خواوەندانە دەنا ، میری بابانیش کە ماوەیەك هەوڵیان دا دەستە مۆی بکەن ، ئەم دادەنیشت و ئەوانیش لە بەردەمیدا رادەوەستان تاقەلیانەکەی بۆ تێ بکەن .(٦٢)

مەسەلەکە وای لێ هات مەولانا خالید بروانێتە ئەو گیر و گرفتە سیاسیانەش کە لە ناو ئەندامانی بنەماڵەی حوکمداری میرنشیندا دەقەومان . ساڵی ١٨١٦

مەحمود پاشای میری بابان مزگەوتێکی بۆ دروست کرد کە تا ئـەمڕۆ بـە نـاوی خانەقای مەولانا ناسراوە .(٦٣)

هۆی تـری زوو بڵاوبونـەوەی تەریقـەتی نەقشەبەندی ئەوەیـە کـە تەریقـەی قادری وەکو تـەریقەیەکی زاڵ ونوێنەری فیکری ئاینی باو بوو ، بـوو بەبەشـتێك لـە سیـستەمی دەسـەڵاتداریەتی بابـان و پـشتیوانی و پـشتگیری ڕژێمەکـەی دەکرد لە کاتێکدا لە کۆمەڵگا گۆڕانکاری قـووڵ ڕوویـدابوو توێـژی کۆمەڵایـەتی نوێ سەریانهەڵدا بـوو وناکۆکیـان لەگـەڵ سیـستەمی کۆنـدا کاکڵـەی کردبـوو و تەریقـەی نەقـشەبەندیش وەکـو ڕێبـاز و هێزێکـی بـەر هەسـتکار بـەرەو ڕووی سیستەمی سیاسی – ئایینی بابـان بـووە و بۆیـە ئاسابیە ئەگـەر خەڵکەکـەی ڕووی تێ بکات جگە لەوە مـەولانا خالیـد تـەنها پیـاوێکی ئـاینی نـەبوو بـەڵکو بەهەمان وادەش دونیایی بووە لە کاتی ئیجازە وەرگرتنی مەولانا خالید لە شـا عبداللە دەهلەوی لە هیندستان داوا داخوازی (دین و دونیا) بـووە . شـا عبـداللە پێ گوتوە برۆ ئەوا هـەموو دایتـێ لـەم ڕووە شـەوە مـەولانا خالیـد چـوار ژنـی هێناوە دوانیان بۆ مەبەستی سیاسی بووە .(٦٤)

ئەوەی هەوڵیدا بێ لێکدانەوەیەکی زانستی بۆ بڵاوبونەوەی خێرایـی ڕێبـازی نەقشەبەندی لە کوردستاندا بەرچاو بخات ڤارتن برۆنسنە کە هۆیەکەی داوەتـە پاڵ جیاوازی لە ڕێبازی قادری و بارودۆخی کۆمەلایەتی سیاسی کوردستان لـە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمـدا . نـاوبراو سـەبارەت بـە خـاڵی یەکـەم لـەوەوە دواوە کە لایەنی گیانی لە لای نەقشەبەندیەکان لە چاو قادریەکاندا ڕەسـەنترە و ڕێبازەکەی لە توکمەی و ڕێکخستن دا وردەکاری تێدایە کە ڕێبازی قـادری لێ ی بێ بەشە ، پەیوەندی هەرسێ ڕێبازی نەقشەبەندی لە هی قادریەکان توند و

تۆڵ ترە .(٦٥) سەبارەت بە هۆی دووەمینیان وای بۆ چووە کە کوردستان لە قۆنـاغی ڕاپـەڕینی دژ بـە عـسمانییەکان دەژیـا وگوشـاری بەرژەوەنـدی یـە ئیمپریالـستەکان ملـی بـۆ ناوچـەکە دەنـا . بۆیـە شـتێکی سروشـتی بـوو کـە ڕێبازێکی وا بـرەو بـسەنێ کـە شـێخەکانی دژایـەتی ئـاینی مەسـیحی و بێگانـە دەکەن .(٦٦)

بەڵگـە لەسـەر ناحـەزی شـێخانی نەقـشەبەندی لـە عوسمانیـەکان زۆرن .خێڵکـانیش لەبـەر ئـەوەی هاتنـە سـەر ئـەم تەریقەتـە چـونکە دەسـەڵات و پەیوەندی کۆمەڵایەتی وئابوریان لە لایـەن بـابی عـالی یـەوە تووشـی مەترسـی ببوو . تەنانەت خۆشی وتبووی کە لـە خولیاکـانی شـێخ خالیـد دەترسـێ کـە گوایـە دەشـێ ئینگلیـز پاڵپـشتی ئـەو بـن . ئـەوەی کـە یـەکێ لـە هۆکـانی سـەرکەوتنی بزوتنەوەکـە دژایـەتی کردنـی مەسـیحیەت و بێگانـە بـن ناچـێ لێکدانەوەیـەکی ڕاسـت بـێ چـونکە ئـەو ناوچـەی ڕێبـازی نەقـشەبەندی تیـادا بلاّوبوەوە هێشتا بەر شالاّوی مزدە بەرە مەسیحیەکان نەکـەوتبوو ، بـۆ نمونـە سلێمانی هیچ کەنیسەیەکی لێ نـەبوو ژمـارەی جولەکـەکانیش زۆر لـە ژمـارەی مەسیحیان زۆر تر بـوو ، بـێ لـەوە ، بزووتنـەوەکـە بەرهەڵسکارانی حکومـەتی بابان و شێخانی قـادری و بەرهەڵستکاری حـوکمی عوسمـانێتی گرتبـووە خـۆ .(٦٧)

ریچ لە کتێبەکەیدا دڵبەندیەکی ئاشکرایی دەرهەق بە مەولانا نیشان داوە کە پەیوەندی بە کۆمپانیای هیندی ڕۆژ هەلاّتەوە هەیە .(٦٨)

بە هەر حاڵ لێهاتوویی و زیرەکی مەولانا کەسایەتی بەهێزی شێخی تەریقەت بەرهەڵستیەکی (دینی) کە دووچاری ڕێبازی نەقشەبەندی بوو هۆیەکی یارمەتی

دەر بوو بۆ پەرەسەندنی ناوبانگ و جەماوەریەتی تەریقەتەکە ، بە تایبەتی لە کوردستانی عێراقدا .

## هەڵوێستی بابانەکان :-

حوکمدارانی بابان هەر تەماشا کەری ئەو ململانێ یەی ناو پایتەخت نەبوون بەڵکو پەیرەوی سیاسەتێکیان کرد کە ئەگەر لە هەڵوێستی جۆر بە جۆری ساڵانەی ١٨١١ – ١٨٢٠ ز و لەوەبەدوایان ورد ببنەوە دەتوانین هێڵە گشتیەکان بناسینەوە ، ،دوو میر لەو قۆناغەدا حوکمداری میرنشیان کرد ،عبدالرحمن پاشا و مەحمود پاشای کوڕی ، سیاسەتی یەکەمیان مەودای بە پەلهاویشتنی هیچ بزووتنەوەیەکی کۆمەلآیەتی یا ئاینی لە میرنشیندا نەدەدا ، ئەگەر ملکەچی دەسەلآتی خۆی نەبوایە ، بۆیە مەولانا پاش هاتنەوەی لە بەغدا لە ساڵی ١٨١١دا ،نەیتوانی لە چەند مانگێك بەولاوە بمێنێتەوە ، چونکە کاتێك عبدالرحمن پاشا هەستی کرد بۆ یەکبونی میرنشین جێ ی مەترسیە ، ناچاری کرد بە جێ ی بهێڵێ ، بێ لەوە کەوتە چەساندنەوەی دەست وپەیوەندەکانیشی لە شاردا ، وەك ئەوەی لە نامەی نێرداوی مەولانا دا بۆ هەندێك لەو بابانیانە کە پەیوەندی دۆستایەتیان لەگەڵ نەبرِیبون دەردەکەوێ . لە کاتێك دا سیاسەتی کوڕەکەی بەوە جیا دەکرێتەوە کە هەوڵی داوە بە نەرم ونیانیەکی زیاتر و زیرەکانە ترەوە شێخی تەریقەتەکە و پاشتر شوێنکەوتوانی بخاتە ژێر رکێفی خۆی .(٦٩)

مەحمود پاشا کە هاتە سەر تەختی حوکمداری ، سەفەری بۆ بەغدا کرد تا پەیوەندی لەگەڵ دا بمەزرێنێتەوە چونکە ئەو پەیوەندیە لە ئاخر و ئۆخری

حوکمداری باوکیدا پچرا بوو ،لەم سەفەرە دا دەست وداوێنی مەولانا بوو تا سلێمانی بگەڕێتەوە ، ئەویش ڕازی بوو ، پاشا چەند پارچە زەویەکی کشتوکالی و گوند و ژمارەیەك باخی بۆ خەرجی قوتابیان و موریدانی کرد بە وەقفی ئەو مزگەوتەی بۆ مەولانا بنیادنا ، ئەم سیاسەتە تا ڕادەیەك سەری گرت چونکە گەلێك لە لایەنگرانی مەولانا کە دوژمنایەتی پاشاکانی بابانیان دەکرد بێنە کنیەوە .(٧٠) بۆچونی باوی ناو حکومەتی بابان مەولانەیان بە پیاوی عوسمانیەکان دادەنا ، کەواتە ئەو بۆ میرنشین جیێ ی مەترسیە ، پەیوەندی بابان بە عوسمانیەکانەوە بەسەر نەقشەبەندیەکاندا شکایەوە ، ئەو دوو جارەی مەولانەیان تیادا شار بەدەر کرد پەیوەندی بە عوسمانیەکانەوە شلۆق بوو ، کاتێك لە ساڵی ١٨١٣–١٨٢٢ دا داوایان لە مەولانا کرد بۆ شارەکەی بێتەوە ئەم پەیوەندیانە روو لە باشی کرد ، دەتوانین نامەکەی مەولانا بۆ والی بەغدا بکەینە بەڵگەیەك لەسەر ئەو ڕێز و حورمەتەی کە لە نێو بابانەکان هەبوو لە هەندێ قۆناغدا بە هۆیەوە یەکێك لەو فاکتەرانەش بزانین کە وایان کردووە بابانەکان گومان لە عوسمان چیەتی بکەن . مەحمود پاشای میری میرانی بابان و عبدالله پاشای مامی و عوسمان بەگی برای و قازی و زۆربەی دەست و پێوەند و پیاو ماقوڵەکانیان داوەت کرد ، پاشان یەك لە دوای یەك قسەمان لەگەڵیان کرد بە پشتیوانی خودای گەورە دڵ و دەرونیان پر لە وەعز و گیرفان و قۆڵی جلەکانیان لە گەوهەرەی لە بز ، تا لە دوایدا ملیان نا و گوێرایەڵ بوون ، ئەوەیان لە خۆیان ڕاماڵی کە بەدرێژایی ساڵان لە ناخیان پەنگی خواردبووەوە لە ئاکامدا پاشگەز بوونەوە ئینجا کۆڕێکمان بۆ بەستن و ئەو پەری توند و تیژیمان لەگەڵ دا نواندن ، ڕێگای فر و فێڵمان لێ

گرتن و هەڕەشەمان لێ کردن هەوڵماندا مەحمود پاشا مەحکم وسوێند بدەین و لەم بارەیەوە بەڵێن و پەیمانی سەبارەت بە پەیوەندی نەکردن بە فارسەکانەوداە .(٧١)

هەموو کوششەکانی بابانەکان بۆ کونترۆڵ کردنی بزوتنەوەکە سەری نەگرت ، شتێکی پێچەوانەی ئەمە مومکین نەبوو بێتە دی ، چونکە زۆربەی نەقشبەندیەکان لەوانە مەولانا دژایەتی حوکمی بابانەکانیان دەکرد ، کاتێك پەیوەندی نێوان بابانەکان و عوسمانیەکان ڕووی لە ساردی کرد و ململانێی قادری – نەقشەبەندی ئەوەندە توند و تیژ بوو کە دەبوایە پاشای بابان هەڵوێست لە مەسەلەی نەقشەبەندیەکان وەربگرێت ، ملی نا و هەڵوێستی وەرنەگرت ، کلۆدیۆس جیمس ریچ کە لە ١٨٢٠ لە سلێمانی بووە ، نوسویەتی (( ئەم بەیانی شێخ خالیدی گەورە هەلأت سەرباری ناکافلیٚ و نهێنیبەری هەلأتنەکە ، هەرچوار ژنەکەشی لەگەڵ خۆیدا برد ، هێشتا نازانین ڕووی لە کویٚ کردووە ، چەند ڕۆژێك لەمەو بەر کوردەکان لە کەسێکی لە عبدالقادر ( مەبەستی شێخ عبدالقادر گەیلانی یە) پایە بەرز تریان دادەنا پاشان کە عادەتی وابوو کەئەم دادەنیشت ئەو لەبەردەمیدا رادەوەستاقلیانەکەی بۆ تێ دەکرد، کەچی ئەمرۆ پیٚ ی دەڵێن کافرو گەلێك قسە و قسەلۆك لەسەر ڕوح زلی و خراپەکاری دەگێرنەوە ، باسی ئەوەش دەکەن چۆن مردنی کوڕی پاشا دەسەلأتی لە دەست دا ، چونکە لافی ئەوەی لیٚ دەداکە گوایە دەتوانیٚ لەمردن رزگاری بکات)) .(٧٢)

هۆی هەلأتنەکەی بە چەندین شێوەی جوراو جۆر باس دەکرێت ، هەندێك دەڵێن ئاژاوەی لە نێو پاشا و براکانیەوە نایەوە پاشاش ویستی ڕوبەرویان

بکاتەوە . هەندێکیش بۆ ئەوە دەچن کە مەولانا بناغەی ڕێبازێکی ئاینی تازەی دادەنا و دەیویست خۆی بکاتە سەرگەورەی ئاینی و دنیای وڵات . ئەوانە بە بێ چەند و چۆنی شێخ خالیدیان بەشتی وا تاوان بارکردوە کە نەی کردبوو . تێکرای زاناکان و سەیدەکان لە سەروشیانەوە شێخ مارف ڕقیان لە شێخ خالید بوو کە تا دوێنی پاشەکشەی پێ کردبوون .(٧٣)

ئەم هەڵاتنە زەبرێکی گورجبڕی لە ڕێبازی نەقشە بەندی لە شاری سلێمانی وەشاند ئیتر مەیدان بە تەواوی بۆ قادریەکان چۆل بوو ، و ئاساواری ئەم مەسەلەیە دواتر دەرکەوت .

## هەڵوێستی دەوڵەتی عوسمانی :-

عوسمانیەکان سیاسەتی خۆیانیان بەرامبەر بە ڕێبازی نەقشەبەندی لە سەر دوو بنچینە هەڵنا :

١- نەخشی بزوتنەوەکە لە نێو میرنشینی باباندا .

٢- دەست ڕۆیی لە سەرتاسەری خاکی دەوڵەتی عوسمانی .

سەعید پاشای والی بەغدا داود پاشای جێنشینی لە سەرەتای پەیدا بوونی تەریقەتەکەدا باوەڕیان پێ هێنا ، مەبەستیان ئەوە بوو کۆنترۆڵی بزووتنەوەکە بکەن بۆ بێ هێز کردنی میرنشینی بابانیش کەڵکی لێ وەربگرن .(٧٤)

کاتێك سوڵتانی عوسمانی لە ساڵی ١٨٨١ دا ئەوەی بۆ والی بەغدا درکاند کە شتی وا نی یە . ئەمجا شێخولئیسلام زەکی زادە مستەفای عاسم هاتە سەر تەریقەتەکە ، مادامێکی ڕێبازەکە سودی بۆ پارچە پارچەی و بێ هێز کردنی میرنشین هەبوو ، سیاسەتی عوسمانیانەی بەغدا لە کوردستاندا پشتگیری کرد

و ڕێگای بۆ کردەوە تا ئیش لە ناوچەیکانی دیکە بکات ، بەلاَم هەرکە ئەم دەورە دوای هات سیاسەتی عوسمانیەکان لە پشتیوانیەوە بۆ چەوساندنەوە و سەرکوت کردن گۆڕا ، چونکە دەسەلاَتدارانی تورك زانیان شێخ خالید و موریدەکانی نابنە داردەستێك کە بەکاری بێنن ، ساڵی ١٨٢٠ والی بەغدا ئەم شێخەی ناچار کرد بەغدا بەجێ بهێڵێ ، لە هەموو ناوچەکانیش کەوتنە تەنگ پێ هەڵچنین و لە نزیکەوەش جولانەوە و پەیوەندیەکانیان لە سوریا لە بەر چاو گرتبوو ، دوای جێهێشتنی بەغدا لەوێ گیرسایەوە و هەر لەوێش مرد (٧٥).

بەلاَم دەوڵەتی عوسمانی هەر بەمە نەوەستا بەڵکو چاودێریەکی توندی لەسەر مەولانا و خەلیفەکانی دانا چونکە لەوە دەترسا کەوا دەست لە کاروباری ڕامیاری وەربدات . سەرەڕای ئەوەش کە مەولانا و خەلیفەکانی دڵنیا بوون کەوا دورن لە کێشەی سیاسی کە چی هێشتا دڵیان بەمە دا نەکەوت و هەندێ لە نەقشەبەندیە بەناو بانگەکان ئەستەمبۆلیان نەفی کرد .(٧٦)

ساڵی ١٨٢٦ چەوساندنەوەی تورکەکان بۆ موریدەکانی شێخ خالید و نەقشەبەندیەکان شێوازێکی فەرمی وەرگرت ئەویش بەدەرکردنی فەمانێك لە سوڵتان مەحمودی دووەم کاریگەری و شوێنەوارێکی زۆریان لەسەر بارو دۆخی سیاسی کوردستان بەجێ هێشت ، ئەوە بوو لە ئەنجامی چەوساندنەوەی فەرمی ئاشکرای دەسەلاَتدارانی تورك زۆر لەو نەقشەبەندیانە چالاکیەکانی خۆیان گواستەوە بۆ ناوچەی شاخاویەکان کە لەوێ حاکمی بەهێزی کورد هەبوون دەیانتوانی بیان پارێزن .(٧٧)

کاتێك توێژی بازاری و ژمارەیەك لە خەلیفە نوێنەرایەتیان دەکرد لە گەلێك نامەیدا ئەوەمان دەستگیر دەبێ کە هەندێك لایەنگری بە توندی پەرەیان بە بیری بەرەنگاری کردنی حوکمی بابان و شێخانی قادری داوە ، کەچی مەولانا تێکۆشاوە قایلیان بکات .(٧٨)

پێش ئەو مێژووە ناکۆکیەکی ئاینی وا لە کوردستاندا ڕووی نەداوە کە قەوارە و ئاستی ناکۆکی قادری نەقشەبەندی هەبوو بێ هێشتا ڕەنگدانەوەی ئەم ناکۆکیە لە پەیوەندی هەردو ڕێبازدا تا ئەمڕۆ دیارە گرنگترین هۆ کە وای کرد ڕێبازی نەقشەبەندی نەتوانێ هەندێك ئامانجی خۆی لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا جێ بە جێ بکات . سیاسەتی ناوەند بەهێز کردنی بوو کە سوڵتان مەحمودی دووەم پەیرەوی کردوە بە دەست وەشاندن لە یەك لە دوای یەکی ڕێبازە سۆفیەکانی دوایی هات دەتوانین لە کۆتایی دا بڵێین بەگشتی هەڵوێستی عوسمانیەکان بەرامبەر بە نەقشەبەندیکان وەمەولانا خراپ بوو .

## دەرئەنجام :

لەم لێکۆڵینەوە بۆمان دەرکەوت کە:

١- (مەولانا خالید کوڕی ئەحمەد کوڕی حسێن ) ، لە تیرەی جافی میکائیلە لە ساڵی ١١٩٣ز لە ناوچەی قەرەداغ لە دایك بووە ، لای گەورە زاناکانی ئەوسای کوردستان خوێندویەتی و پلەیەکی چاکی لە زانستەکان بەدەست هێناوە ، لە دوایدا چووەتە حەج و پاشان چووە بۆ هیندستان لەوێ ڕێبازی نەقشبەندی وەرگرتووە یەکەم کەسە کە ئەم ڕێبازەی لە کوردستانی خوارو بڵاوکردبێتەوە و بە نوێ کەرەوەی ئەم ڕێبازە دا ئەنرێت و سەرۆکی تەریقەتی نەقشەبەندی بووە ، زانایەکی پایەبەرز و مامۆستایەکی لێهاتوو شاعیرێکی بە ناوبانگ و ناودارە ، دیوانی شیعری کوردی و فارسی چاپ کراوە بەناوی دیوانی مەولانا خالید ، و چەندین بەرهەمی تر لە زانستە جیا جیاکان ئایین هەیە ، و لەشاری دیمەشقی سوریا کۆچی دوایی کردوە .

لەم لێکۆڵینەوەیە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە مەولانا خالید پلە و پایەکی بەرزی هەبووە لە ناو خەڵك بەگشتی و میرانی بابان بە تایبەتی ، بۆ نمونە لەکاتی گەڕانەوەی لە هیندەوە بۆ کوردستان پێشوازیەکی گەرمیان لێکرد ، یان کاتێ لە بەغدا بوو میر مەحمودی میری بابان خۆی لە بەغدا داوای لێکرد بگەڕێتەوە بۆ کوردستان و خانەقا و مزگەوتی بۆ دروست کرد زەوی و زاری زۆری لەسەر وەقف کرد جگە لەمە زۆرجاری تر ڕاوێژی پێکراوە بۆ کاروبارەکانی وڵات و هەر لە لایەن خودی مەولاناوە بۆ ئاشت کردنەوەی نێوان میرانی بابان هەوڵی داوە و سوێندیان لە لا خواردوە بۆ ئەوەی خیانەت لەگەڵ یەکتر نەکەن و لە نێو خەڵکیش بەئەوپەڕی ڕێزەوە سەیریان دەکرد لە ڕیزی

(شێخ عبدالقادر گەیلانی ) دایان دەنا ، و جاری واش بووە لە لایەن هەندێك لە میرانی بابانەوە نێوانیان ناخۆش بووە و لەبەریان ڕاکردوە چووە بۆ بەغدا و لەگەڵ ڕێبازی قادری ناکۆکی هەبوە وهەردەم هەوڵی داوە بە پێ ی سەرچاوە مێژوییەکان کە دەڵێن خودی شێخ مەعروفی نۆدەی و موریدەکانی هەوڵیان داوە بۆ لەکەداری کردنی پایەی مەولانا خالید.

مەولانا خالید دوای گەڕانەوەی بۆ سلێمانی لە ماوەیکی کورت دانا و ناوبانگی نەك سنوری میرنشینی بابان بەڵکو بەغدا و شام وئەستەنبولیشی گرتەوە لەهەموو لایەك خەڵك ڕووی تێدەکەن بۆ تەریقەت و ئیرشاد و بۆیە هەر لە ماوەیکی کورت توانی جێگای خۆی لە ناو دڵ و دەروونی هەزارەها ڕێبواران بکاتەوە وچوارچێوەی سنوری تەسکی سلێمانی بپچڕێنێ و نیوەی یەکەمی سەدەی سیانزەی کۆچی مەولانا خالیدی نەقشەبەندی بە نوێکەرەوەی ئەم سەدەیە دادەنرێت .

بۆمان دەردەکەوێت لەم لێکۆڵینەوەیە کە عوسمانیەکان لە سەرەتا هەڵوێستی باشیان هەبووە لەگەڵ مەولانا خالید ، بۆ نموونە سەعید پاشا و داود پاشا هاتنی خۆیان بۆ سەر ڕێبازی نەقشەبەندی ڕاگەیاند بەڵام لە دوایدا بۆیان دەرکەوت کە مەولانا خالید نابێتە داردەستێك بۆ هینانەدی ئاواتەکانیان بۆیە دەوڵەتی عوسمانی هەڵسا بە ئازاردانی مەولانا خالید و موریدەکانی و دەستی کرد بە دەرکردنی بڕیارێك بۆ سەرانی تەریقەتی نەقشەبەندی بۆ نەفی کردنیان لە ئیستەمبولەوە بۆ ناوچەکانی تر.

بە شێوەیەکی گشتی مەولانا خالید دژی هەموو دەسەلاتێکی زۆردارانە بووە کە دژی خەڵکی هەژار و بێ تاوان بووە .

## پەراوێز و سەرچاوەکان

(١) ژمارەیەك نوسەرو هونەرمەند ،یادی (٢٠٠) ساڵەی شاری سلێمانی ، ، سلێمانی ٢٠٠٣ ، ل ٢٨.

(٢) ملا عبدالكريم مدريس ،یادی مەردان ،بەرگی یەکەم ، بەغدا ،١٩٧٩، ،ل٧

(٣) خالید شارەزووری نەقشبەندی ،عەقیدەی ئیمان ،ئاشنا کردن ولێکۆڵینەوەی بابی لالۆ کمال رۆوف محمد ، ،هەولێر ،٢٠٠٤ ،ل٧٥ .

(٤) عباس العزاوي ،الشهرزور السليمانيه (اللواو المدينه) ،الاولى ،بغداد ،٢٠٠٥ ،ص٢٧٥ .

(٥) ملا عبدالكريم مدريس .س ــ پ ، ل٧.

(٦) ملا عبدالكريم مدريس .س ــ پ ، ل٧.

(٧) مەحەمەد ئەمین زەکی بەك ، مشاهير الكرد والكردستان ، الجزء الاول ، ، بغداد ،١٩٤٥ ،ص١٩١ ،(حامد) حاجی شێخ حامد حیسامی ، یادی شاعیرانی کورد ، یەکەم ، تاران ، ١٣٨٢ ل٦٥ ، ملا عبدالكريم مدرس ، ه _ س_ ب ،ل٨ .

(٨) عباس العزاوي ، المصدر السابق ، ص٢٧٥ .

(٩) رۆڤار : بلاْوکراوەیەکی رۆشەنبیریە هەر ژمارەی تایبەتە بە نووسەرێك ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەردوو مانگ جارێك دەری دەکات ،ژمارە ١٢، .

(١٠) ملا عبدالكريم مدريس .س ــ پ ، ل٨.

(١١) ملا عبدالکریم مدریس .س ــ پ ، ل٩.

(١٢) ملا عبدالکریم مدریس ، علماؤنا فی خدمه العلم والدین ، الطبعة الاولی ، بغداد ،١٩٨٣ ، ص٢٧٥ .

(١٣) زیارەت گوندێکە لە نزیك هاوینەهەواری سەلاحەددین ولە سەروی شەقلاوە ، مەلا تانی بە مەلا زادە ناوی درکردووە .

(١٤) ئەم زاتە محمدی کوڕی ئادەمی کوڕی عبداللە لە دەورە و بەری ١٧٤٧ ز لە گوندی (روستێ) ناوچەی باڵەك لە دایك بووە سەر هۆزی باڵەکە و یەکێك لە زانا پایە بەرزەکانی سەردەمی خۆی و چەندین نوسراوی هەیە .

(١٥) مەحەمەد ئەمین زەکی بەك ، المصدر السابق . ص١٩١.

(١٦) ملا عبدالکریم مدریس .س ــ پ ، ل١٠ .

(١٧) مەولانا خالید ، دیوانی رۆحی مەولانا خالید ، و_ پیرەمێرد ، پێداچونەوەی مەحمود ئەحمەد مەحەمەد ، یەکەم ، بغداد ، ١٩٨٧ ،ل ٢٠ .

(١٨) صدیق صفی زادە ( بۆرەکەیی ) مێژووی وێژەیی کوردی ، یەکەم ، جهر تبرێز ١٢٧٥ ، ل ٤٧٢ .

(١٩) محمد صالح ابراهیم ، گەنجینەی فەرهەنگ و زانست ، مهارت ، شهران ١٣٦٤ ، ل ٣٢ .

(٢٠) خالید شارەزووری نەقشەبەندی . هـ، س، ب ، ل ٧٧ .

(٢١) عبدالکریم محمد المدرس ، المصدر السابق ، ص ١٨٦ .

(٢٢) ملا عبدالکریم مدریس ، المصدر السابق ص ١٨٦.

(٢٣) محمد صالح صدیق ، هـ، س،ب،ل٣٢ .

(٢٤) محمد صالح صدیق ، هـ، س،ب،ل٣٢,٣٢.

(٢٥) ملا عبدالكريم مدريس .هـ س ، پ ، ل ٣٨ .

(٢٦) عباس العزاوی ، المصدر السابق ، ص ، ٧٠١

(٢٧) ملا عبدالكريم مدريس .هـ س ، پ ، ل ٣١ .

(٢٨) محمد احمد درنقيـه ، الگريقـه النقشبنديه واعلامهـا ، جـروس بـرس . ١٩٨٧ ،ص٨١ .

(٢٩) مەحەمەد ئەمین زەكـی بـەك ، بـەرگی سـێ یـەم ، سـلێمانی ، ٢٠٠٥ ، ل١٦٤ .

(٣٠) مەولانا خالید شارەزوری نەقشبەندی ، هـ ، س، ب، ل ٧٧_٧٨ .

(٣١) ملا عبدالكريم مدريس .هـ س ، پ ، ل ٣٥ .

(٣٢) محمد صالح ابراهيم ، هـ،س،ب،ل٣٨ .

(٣٣) مەحەمەد ئەمین زەكی بەك ، م.س.ص١٩١ .

(٣٤) محمد الخال ، الشيخ النوديهى البرزنجي ، بغداد ، ١٩٦٧ ، ص٤١ .

(٣٥) ملا عبدالكريم مدريس .هـ س ، پ ، ل ٤١ .

(٣٦) ملا عبدالكريم مدريس .هـ س ، پ ، ل٤١ .

(٣٧) دیقد مەكرادل ، مێژووی هلاوچەرخی كورد ، و ، ئەبو بـەكر خۆشـناو ، ج دووەم ، هەولێر ٢٠٠٥ ،ل ٩٤ .

(٣٨) كلوديوس جيمس ريچ ، گەشـتنامەی ریـچ بـۆ كوردسـتان . ١٨٢٠ ، و. محمد حەجە باقی ، هەولێر ،٢٠٠٢ ل ١٥ .

(٣٩) كلوديوس جيمس ريچ ، هـ ،س ،ب ،ل٢٨٨_٢٨٩ .

(٤٠) كلوديوس جيمس ريچ ، هـ ،س ،ب ،ل٢٨٩ .

(٤١) ملا عبدالكريم مدريس .هـ س ، پ ، ل٤٧ .

(٤٢) ملا عبدالكريم مدريس .هـ س ، پ ، ل ٥٠ .

(٤٣) محمد ئەحمەد دریقە ، م،س،ص،٨٢ .

(٤٤) صديق صفى زادە (بورەكۆی) هـ،س،ب،ل٤٧٢ .

(٤٥) مەولانا خالید شارەزوری نەقشبەندی ، هـ ، س، ب، ل ٦٨ .

(٤٦) مەحەمەد ئەمین زەکی بەك ، م.س.ص١٩٢ .

(٤٧) ملا عبدالكريم مدريس .هـ س ، پ ، ل ٥٦ .

(٥٧) مەولانا خالید ، دیوانی رۆحی مەولانا ، پیرەمێرد ،بغداد ،١٩٨٧، ل ١٧٧.

(٥٨) کلودیوس جیمس ریچ ، هـ ،س ،ب ،ل١٦ .

(٥٩) محمد ئەحمەد دریقە ، م،س،ص،٨٨ .

(٦٠) محمد رسول هاوار ، شێخ محمود قارەمان ، دەوڵەتەکەی خواروی کوردستان ، بەرگی یەکەم ،ل ٧٧ .

(٦١) ابراهیم احمد شوان ،سۆفیگەری شیعری ئاینی و سۆفسیگەری لە شیعرە کوردیەکانی موسویدا ،یەکەم ، هەولێر ،٢٠٠١ ، ل٨١ .

(٦٢) کلودیوس جیمس ریچ ، هـ ،س ،ب ،ل١٤٢ .

(٦٣) کلودیوس جیمس ریچ ، هـ ،س ،ب ،ل١٤ .

(٦٥) یاداشتەکانی شێخ رۆوفی شێخ محمود ،لە شێخ محمودی قارەمان .بەرگی یەکەم ،محمد رسول هاوار ،ل ١٢٤ وەرگیراو .

(٦٦) عبدالرحمن بیلاف بەرزەنجی ، تەریقەتی نەقشەبەندی ، بەرگی یەکەم ، یەکەم ، هەولێر .٢٠٠٢ ل١٥٤_ ١٥٥ .

(٦٧) کلودیوس جیمس ریچ ، هـ ،س ،ب ،ل١٦ .

(٦٨) یادی نەمران ،هـ،س،ب،ل٩٦ . شیروان شارێکە لە نزیك باکۆی پایەختی ئازەربایجانی سۆڤیەتی جاران .

(٦٩) کلودیوس جیمس ریچ ، هـ ،س ،ب ،ل١٤ .

(٧٠) ملا عبدالکریم مدریس .هـ س ، پ ، ل ٨٣ _ ٨٦ .

(٧١) عباس العزاوی ، المصدر السابق ، ص ٧١٩ .ئاشکرایە جیاوازی هەردوو ژمارەکە زۆرە بەلاّم ریچ بەس باسی کوردستان وتورکیا چونکە خۆی لە کوردستان بوو بەلاّم عزاوی مەبەستی هەموو ولاّتانە .

(٧٢) کلودیوس جیمس ریچ ، هـ ،س ،ب ،ل١٤ .

(٧٣) ژمارەیەك نوسەر و هونەرمەند ، یادی دووسەد ساڵەی شاری سلێمانی ،٢٠٠٣،ل٢٩ .

٧٤) (شاد میران )،رەوشتی ئاینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا ، کوردستان ،٢٠٠٠ ل٦١ .

(٧٥) von businesses .m.m , agha ,shailh and political organization of Kurdistan ,Amsterdam, 1978 ,p.p 287 -5 .

(٧٦) Edmond –c-j- Kurds, yirk sand barbs , London ,1957. p.7.7

(٧٧) رۆڤار : بلاّوکراوەیەکی ڕۆشنبیریە ،دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێك دەری دەکات .

(٧٨) کلودیوس جیمس ریچ ، هـ ،س ،ب ،ل١١ .

# هەڵوێستی نوری سەعید بەرامبەر بە راپەڕینی بارزانی ۱۹٤۳ -۱۹٤٥

موحسین مامل محەمەد

دوای ئەوەی بارزانیەکان لە ئەنجامی راپەڕینی یەکەمی بارزان ڕەوانەی (ئەدرنە)* کران لە ساڵی ۱۹۳۳ ، ئەوەبوو حکومەتی تورکیا توانی حکومەتی عێراقی ڕازی بکات بۆ لێبوردن لە بارزانی یەکان و گەڕانەوەیان [1]. ئەوەبوو شێخ ئەحمەدو مەلا مستەفاو ۹۰ لە هاورێکانی گەڕانەوە موصل ، وە لەوێش متصرفی موصل ̌ وەکو تاوانبار مامەڵەی لە گەڵ کردن و ڕەوانەی ناصریەی کردن ، دواتریش لە وێشەوە ڕەوانەی سلێمانی کران ، وەکاتێك لە سلێمانی بوون ، لە ژیانێکی زۆر ناخۆش دابوون بە تایبەتی دوور لە ناوچەکانی خۆیان ، وە لە نێوان سالانی ۱۹٤۰ – ۱۹٤۲ ناخۆشترین ژیانیان لە وێ بەسەربرد بە تایبەتی لە ئەنجامی خراپی مامەڵە کردنی موتوسەریفی سلێمانی کە ئەو کات مستەفا قەرەداغی بوو کە هەڵسا بەبڕینی ئەو یارمەتیەی کە حکومەت بۆ بارزانی یەکانی دابین کردبوو هەروەها لە لایەکی تر خەڵکی سلێمانیشی ئاگادارکردبووەوە لە یارمەتی نەدانی بارزانی یەکان [2]. ئەوەبوو لە ئەنجامی ئەو هۆکارانە بارزانی بڕیاری دا کە لە سلێمانیەوە بگەڕێتەوە ناوچەی بارزان .

دوای گەیشتنەوەی بارزانی بۆ ناوچەکانی بارزان ژمارەیەکی زۆر لە شۆڕشگێران هاتنە ڕیزیەوە ، هەرچەندە لە سەرەتادا بارزانی نیازی شەڕکردنی

نەبوو بەڵکو بەردەوام دەیویست لە ڕێگای ئاشتی کێشەکان چارەسەر بکات بەڵام کاتێك حکومەت وپەنای بردە بەر کاری سەربازی لێرەدا مستەفا بارزانیش ناچاربوو کە کێشەکان لە ڕێگای سەربازی یەکلابکاتەوە(٣). ئەوەبوو لە سەرەتا بارزانی هەڵسا بە داماڵینی چەك لە بنکەکانی پۆلیس لێرەدا چەند شەڕێك لە نێوان شۆڕشگێرە کوردەکان و هێزەکانی حکومەتی عێراقی ڕوویدا(٤).

لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٣ چەند بنکەیەکی پۆلیس دەستی بەسەر داگیرا لە لایەن شۆڕشگێڕانەوە ، لە گرنگترین ئەو بنکانەش ( شانەدەر ، سیلکی ، خێرەزۆك ) بوون و ئەوەی شایەنی باسکردن بێت لە خێرەزۆك شەڕێکی سەخت ڕوویدا ،(٥) لەم شەڕەدا بارزانی ڕاستەوخۆ خۆی تێدا بەشداری کرد و تواندرا دەست بەسەر ژمارەیەکی زۆر پارچە چەك دابگیرێت (٦).

لە ئەنجامی ئەو سەرکەوتنە یەك لە دوای یەکەی شۆڕشگێڕان حکومەت بڕیاری دا پارمەتی سەربازی لە پۆلیس و سەرباز بۆ مێرگەسوور بنێرێ بۆ ئەوەی ئەم ڕاپەڕینە ناوچەکانی تریش نەگرێتەوە ، بەڵام ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت ئەم کارەی حکومەت هیچ کاریگەری نەبوو لەسەر دابەزینی ورەی شۆڕشگێڕان ، دوای ئەوەی شۆڕشگێڕان توانیان چەندین سەرکەوتنی تر بەدەست بهێنن کاتێك توانیان دەست بەسەر حەڤدە بنکەی پۆلیسی تر دابگرن لە ناوچەکانی بارزان تەنها سێ بنکەی پۆلیس لە ژێر دەسەڵاتی حکومەت دامابوو ئەوانیش بنکەی بلەو مێرگەسورو بارزان بوون (٧)

دوای ئەو سەرکەوتنە خێرایانە بارزانی گوندی ( بیستری ) نزیك مێرگەسۆری کرد بە بنکەی سەربازی و سەرکردایەتی خۆی ، دواتر سەربازگەی مێرگەسۆر

کەوتە مەترسیەوە لە لایەن شوڕشگێڕان بە تایبەتی دوای ئەوەی ئابلۆقەیان خستە سەری ، هەرچەندە حکومەت چەند جارێك پەلاماری شۆڕشگێڕانی دا بەڵام سەرکەوتوو نەبوو تەنانەت کاریگەریشی نەبوو لە سەر لابردنی ئەو ئابلۆقەیەی کە شۆڕشگێڕان خستبوویانە سەر سەربازگەکە[8]. ئەوەی لێرەدا بەدیاردەکەوێت پاش ئەو سەرکەوتنانە حکومەت هەروەکو پیشەیەکی بەردەوامی بە تایبەتی کەسایەتی نوری سەعید ڕێگایەکی تری گلرتە بەر بۆ وەستاندنی ڕاپەڕینەکە ، ئەوەبوو لەسەر داوای نوری سەعید شێخ ئەحمەد بارزانی نامەیەکی بۆ مستەفای برای نارد

که تێیدا داوای لێکردبوو کە دەست هەڵبگرێ لەم ڕاپەڕینە ، بەڵام بارزانی ئەم داواکاریەی ڕەتکردەوە وەسوور بوو لەسەر دەست بەسەر داگرتنی بنکەکانی حکومەت [9]، نەتەنها ئەوەندە بەڵکو سوور بوو لەسەلر ئابلۆقەنەدانی سەربازگەی مێرگەسوڕ کاتێك حکومەت داوای لێکردبوو کە دەست هەڵبگرێ ، لێرەدا بارزانی داوای لە حکومەت کرد کە ئەو دەست پێشحەری بکات چەنکە ئەوانە لە سەرەتادا پەلاماری ناوچەکانی بارزانیان داوە [10].

لێرەدا دەکرێت بوترێت کۆمەڵێك هۆکار یارمەتی بارزانیەکانی دا بۆ ئەو سەرکەوتنە یەك لە دوای یەکانە ، وە لە هەموویان لە پێشتر ئەو هەڵوێست و ڕۆحە بەرزەی کە شۆڕشگێڕان هەیان بوو ، هەروەها پاڵپشتی کردنی بەردەوامی خەڵکی ناوچەکە بۆ ڕاپەڕینەکە ، هەروەها ئافرەتانیش ڕۆڵی خۆیان هەبووە لەم ڕاپەڕینە کاتێك نان و ئاویان بۆ شۆڕشگێڕان دابین دەکرد ، لە لایەکی تر ناکرێت نکۆڵی لەوەبکرێت کە جوگرافیای ناوچەکە هۆکارێکی تر ی

ئەو سەرکەوتنانە بووە چونکە شۆڕشگێڕان شارەزایەکی چاکیان لە ناوچەکە هەبووە [11].

دوای ئەو شکستانەی حکومەتی عێراقی تووشی هات لە بەرامبەر هێزەکانی بارزان، ئەوەبوو لە ١٩ی کانونی یەکەمی ١٩٤٣ نوری سەعید دەستی لە کارکێشایەوە ، دواتر لە ٢٥ ی هەمان مانگ حکومەتێکی تری پێك هێنا بەم کارەش بڕیاری دا کە دانووستان لە گەڵ سەرکردایەتی ڕاپەڕینەکە بکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد [12].

لێرەدا بە دیاردەکەوێت دوای ئەوەی نەیتوانی لە ڕێگای سەربازی ڕاپەڕینەکە سەرکوت بکات [13] ئەوەبوو لە ٢٥ی کانونی یەکەمی ١٩٤٣ نوری سەعید کابینەی وەزارەتی حەوتی پێك هێنا ، لەم کابینە نوێیەدا سێ وەزیری کوردی تێدابوو ئەوانیش (( ئەحمەد موختار بابان )) وەزیری دادو ، (( عەمەر نەزمی )) وەزیری ناوەخۆ ، (( ماجد مستەفا )) وەزیری دەوڵەت (( وزیر بلا وزارە )) لێرەدا ماجد مستەفا بە تایبەتی دانرابوو بۆچارەسەرکردنی ئەو کێشەی لەو کاتەدا لە ئارادابوو [14]. ئامانجی نوری سەعید لە دانانی ماجد مستەفا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بیکات بە نێوەندێك لە نێوان حکومەت و مەلا مستەفا بۆمەبەستی زانینی داواکاریەکانی مەلا مستەفاو دانانی چارەسەرێکی کاتی بۆ کێشەی کورد ، هەروەها لە لایەکی تر دانانی ماجد مستەفا دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك ئەوەتا لە لایەك ماجد مستەفا شارەزایەکی تەواوی هەبوو لە ناوچەکانی ڕاپەڕینەکە [15]، لە لایەکی تر لە ساڵی ١٩٣٠ قایمقامیەتی ئامێدی بووە [16]، هەروەها لە سەرەتای سیەکان نێوەندایەتی نێوان حکومەت و شێخ ئەحمەدی بارزانی کردووە ، وەهەر لەو

کاتەدا ماجد مستەفا مەلا مستەفای ناسیووە [17]. سەرەتا ماجد مستەفا داوای لە مستەفا بارزانی کرد یارمەتی بدات بۆ ئەو کارەی کە پیٚ ی سپێردراوە ، وە بۆ ئەو مەبەستە ماجد مستەفا سەردانی شێخ ئەحمەدی بارزانی کرد کە ئەو کاتە لە (( حیللە )) بوو ، وەداوای لێکرد کە شێخ محمد خالیدی کوڕی بنێرێتە بارزان بۆئەوەی مستەفا بارزانی ڕازی بکات لە گەڵ حکومەت ڕێك بکەوێت ، ئەوەبوو بۆ ئەم کارە محمد خالید لە ٢٩ ی کانونی یەکەمی ١٩٤٣ گەیشتە ناوچەی بارزان[18]، دواتریش خۆشی ماجد مستەفا پەیوەندی بە سەرکردایەتی شۆڕشی کورد کرد ، ئەوەبوو لە ٧کانوونی دووەمی ١٩٤٤ لەگوندی (( سپیندارى )) نزیك مێرگەسور لە دانیشتنێکدا بارزانی داخوازیەکانی گەلی کوردی خستە ڕوو بۆ ئەوەی حکومەت جێبەجێیان بکات کە پێك هاتبوو لە مانەی خوارەوە [19] : -

١) گواستنەوەی ئەو فەرمانبەرانەی کە بە بەرتیل خۆری و خراپ بەکارهێنانی دەسەلآتیان لە ناوچەکە ناسرابوون .

٢) پێکهێنانی ویلایەتی کوردستان لە لیواکانی ( کەرکوك و سلێمانی و هەولێرو قەزاکانی کوردی لیوای موصلٚ کە بریتی بوون لە زاخۆ، ئامێدی ، خانەقین ، مەندەلی لە لیوای دیالی )

٣) لەم ویلایەتە زمانی کوردی زمانی ڕەسمی بێت .

٤) دانانی یاریدەدەرێکی کورد لە هەر وەزارەتێك .

٥) پێکهێنانی وەزارەتێك کە وەزیرەکەی کورد بێت وەکاروباری ویلایەتی کوردستانی پێبسپێردرێت .

٦) قەرەبووکردنەوەی ئەو کەسانەی کە زیانیان پێگەیشتووە .

٧) کردنەوەی قوتابخانەو نەخۆشخانەو هەروەها کرداری ئاوەدانکردنەوە لە ناوچەکە .

٨) گێڕانەوەی دوورخراوەکان بۆ ناوچەکانیان و بەردانی زیندانی یەکان.

لێرەدا بە ڕوونی بەدیاردەکەوێت کە داواکاریەکانی مستەفا بارزانی مافی نەتەوەی بوو وەداوای جیابوونەوەی کوردستانی نەدەکرد لە عێراق بەڵکو داوای دەکرد کە ناوچە کوردیەکان سەر بە عێراق بێ بەڵام لە ژێر سایەی حکومەتێکی لامەرکەزی بێ واتە نیمچە سەربەخۆی هەبێ ، بەڵام ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت ڕاستەوخۆ ئەم داواکاریانە لە لایەن حکومەتی عێراق و بەریتانیا ڕەتکرایەوە [٢٠] .

ئەوەبوو ماجد مستەفا لە ٨ی کانوونی دووەمی ١٩٤٤ ناوچەی بارزانی جێهێشت وەلە شەوی ١١/١١ی هەمان مانگ نامەیەکی تەلەفۆنی ئاڕاستەی وەزارەتی ناوەخۆی عێراقی کرد وای دەرخستبوو کە مستەفا بارزانی بە بێ مەرج خۆی بە دەستەوە دەدا وە ئامادەشە بۆ هەر شوێنێ بچێت کە حکومەت مەبەستی بێ [٢١] .

لە ١٤ی هەمان مانگ ماجد مستەفا گەڕایەوە بارزان وە لە هەمان کاتدا چاوی بە باڵوێزی بەریتانیا کەوت ، وە ئەو پێشنیارانەی خوارەوەی خستە ڕوو :

١- لێبوردن بۆ بارزانی و دەست نیشانکردنی گوندێك لە لایەن حکومەتەوە کە بارزانی تێیدا نیشتە جێ بێت .

٢- لێبووردنی گشتی بۆ شێخ ئەحمەدی بارزان و گەورە پیاوانی تری بارزان و گەڕانەوەیان بۆ شوێنی خۆیان .

٣- هەڵبژاردنی چەند ئەفسەرێکی پلەدار بە پلەی ئەفسەری پەیوەندی دار ( ضابط ارتباط ) بە مەبەستی ئارام کردنەوەی ناوچەی بارزان .

٤- ناردنی دانەوێڵ بۆ ئەو ناوچانەی کە شەڕ تێیدا ڕوویداوە .

٥- کشانەوەی سوپای عێراقی لە ناوچەی مێرگەسۆر وەدووبارە دامەزراندنەوەی هەندێك بنکەی پۆلیس لە ناوچەکە .

ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت یاخود شایەنی باسکردن بێت ئەوەیە کە ئەو پێشنیارانەی ماجد مستەفا پێشکەشی باڵوێزخانەی بەریتانیای کرد زۆر دوور بوونە لەو داواکاریانەی کە بارزانی لە ٧ کانونی دووەمی ١٩٤٤ داوای کردبوو[٢٢] .

دواتر ماجد مستەفا ڕاپۆرتێکی پێشکەش بە نوری سعید کرد، لەم ڕاپۆرتەدا دووپاتی کردەوە کە خراپی باری بەڕێوەبردن و کەمی داهات دوو هۆکاری سەرەکی بوون بۆ ئەوەی مستەفا بارزانی شاری سلێمانی جێ بهێڵێ و هەروەها ئەو پێشنیارانەی خستە بەردەم حکومەت.

١- گێڕانەوەی ئەو بارزانیانەی کە دوور خرابوونەوە.

٢- دەست پێشخەری بکرێت لە دووبارە دامەزراندنەوەی بەڕێوەبەرایەتێکی حکومی لەو ناوچانەی کە یاخی بوون تێیدا بەرپابووە وە دامەزراندنی فەرمانبەری لێهاتوو بۆ ئەو ناوچانە.

٣- دابین کردنی پارە بۆ چاکردنی هێڵەکانی تەلەفۆن و ڕێگا لە بلێ یەوە تاوەکو عەقرە، وە لەبلێوە تاوەکو ئامێدی وە دامەزراندنی بنکەی پۆلیسی بەهێز لەم ناوچانە بۆ ئەوەی حکومەت بتوانێ کۆنترۆڵی ناوچەکە بکات.

٤- دابەشکردنی خۆراك لەم ناوچانە بەبێ بەرامبەر یاخود بە نرخێکی کەم.

٥- ناردن بە دوای بارزانی بۆ هاتنی بۆ بەغدا بۆ ئەوەی چاوی بە وەصی بکەوێت.

دوای پێشکەش کردنی ئەم راپۆرتە نوری سعید لیژنەیەکی پێك هێنا بۆ لێکۆڵینەوە لە راپۆرتەکە ئەوە بوو لە ٢٥ کانونی دووەمی ١٩٤٤ ئەنجومەنی وەزیران کۆبونەوەیەکی گرێدا وە لەم کۆبونەوەیەدا ئەم بریارانەی خوارەوەی دەرکرد[٢٣].

١- دامەزراندنی بەرێوەبەرایەتێکی نوێ بۆ قەزاکانی زێبار، رواندز، ئامێدی، دەوروبەری مێرگەسۆر، شێروان مەزن، دامەزراندنی کاربەدەستی باش ئەگەر پێویست بوو ئەفسەری پەیوەندی دار (ضابط ارتباط) یان بۆ بنێردرێ.

٢- کردنەوەی بنکەی پۆلیس لە خەلیفان، رێزان، ئامێدی، بلە، عەقرە، بارزان، مێرگەسۆر، شێروان مەزن، دیانە، کانی رەش.

٣- دوور خستنەوەی مستەفا بارزانی لە ناوچەی بارزان.

٤- گێرانەوەی شێخ ئەحمەد بارزانی و خێزانی بۆ ناوچەکەی خۆیان، وە چوونی مستەفا بارزانی بۆ بەغدا بۆ خۆ بەدەستەوەدانە بەلأم بریار لەسەر ئەم خاڵە دەکەوێتە ئەستۆی وەزیری ناوەخۆ و وەزیری دەوڵەت (وزیر بلا وزارە).

٥- ئەو ناوچانەی بارزانی دەستی بەسەر گرتوون بگەرێنەوە بۆ حکومەت.

٦- حکومەت بریاری لێبوردنی گشتی دەربکات بۆ بارزانیەکان تەنها بۆ ئەوانە نەبێ کە چەکدارن، هەروەها ئەو ئەفسەرانەی کە لە رێزی حکومەتەوە

چوون بۆ ڕیزی چەکداران، وە حکومەت خۆی بڕیاری لێ خۆش بوون دەربکات.

٧- هەر وەزارەتێك چی لە ئەستۆ دایە دەبێ جێ بەجێی بکات[٢٤].

دواتر کاتێك نوری سەعید کابینەی وەزارەتی هەشتەمی دامەزراند هەندێك لەو بەڵێنانەی جێ بەجێ کرد لەوانە: کشانەوەی هێزەکانی لە مێرگەسۆر[٢٥]، هەروەها گێرانەوەی شێخ ئەحمەد و هاوڕێکانی بۆ ناوچەی بارزان[٢٦]، لە لایەکی تر دابین کردنی پێداویستی وەکو خۆراك و جل و بەرگ بۆ ئەو ناوچەیە[٢٧] هەروەها گۆرینی هەندێك فەرمانبەر لە ناوچەکە کە خەڵك نارەزایی لێیان هەبوو وە دانانی چەند ئەفسەرێکی پەیوەندی دار کە لە ژێر سەرپەرشتی وەزیری دەوڵەت دابوون.

مەسەلەی دامەزراندنی ئەفسەرە پەیوەندی دارەکان لەسەر داواکاری ماجد مستەفا بوو لەسەرەتادا سێ کەس لە ئەندامانی پارتی هیوای دامەزراند بە پلەی ئەفسەری پەیوەندی دار[٢٨]. دواتر بۆ زیاتر خۆ نزیك کردنەوە لە پارتی هیوا ماجد مستەفا داوای لە وەزارەتی ناوەخۆ کرد کە ژمارەی ئەفسەران زیاد بکرێت، بۆ ئەم کارە لە ٢٧ کانونی دووەمی ١٩٤٤ وەزارەتی بەرگری بڕیاری دامەزراندنی چەند ئەندامێکی پارتی هیوای دا بە پلەی ئەفسەری پەیوەندی دار (ضابط ارتباط) وە هەریەکەیان بۆ ناوچەیەك نێردران وە بریتی بوون لەمانەی خوارەوە[٢٩]:

١- لیوا بەهائەدین نوری بۆ لیوای سلێمانی.

٢- نەقیب سەید عەزیز سەید عبدالله بۆ مێرگەسۆر.

٣- نەقیب مستەفا خۆشناو بۆ بارزان.

٤- نەقیب میرحاج ئەحمەد بۆ ئاکرێ.

٥- نەقیب فوئاد عارف بۆ ناوچەی پشدەر.

لێرەدا دانووستانەکان لەگەڵ حکومەت بووە مایەی سەرکەوتنێکی گەورە بۆ راپەرینەکە، هەروەك حسن مستەفا ئاماژە بەوە دەکات لە حکومەت گەورەترین هەڵەی کرد کاتێك دانووستانەکانی لەگەل مستەفا بارزانی کرد لە رێگەی یەکێك لە لە وەزیرەکانی کە ماجد مستەفا بوو، جا ئەم دانووستانانە خۆی دان پیانانێکی ئاشکرا بوو بۆ سەرکردایەتی مستەفا بارزانی لە ناوچەکانی بارزان[٣٠].

دواتر لەسەر داواکاری وەزیری دەوڵەت مستەفا بارزانی بڕیاریدا بچێت بۆ بەغدا بۆ گفتوگۆ کردن و رێکەوتن لەگەڵ حکومەت[٣١].

ئەوەبوو لە ڕۆژی دووشەمە لە ٢١ شوباتی ١٩٤٤ مستەفا بارزانی گەیشتە موصڵ لە ئوتێلی دیجلە دابەزی، وە هەر لەم ڕۆژەدا کۆنگرەیەکی رۆژنامە نووسی ساز کرد، لەم کۆنگرەیەدا ئاماژەی بە کێشەی کورد کرد وە تێدا روونی کردەوە کەوا ئەم کێشەیە کێشەی تاکە کەس نی یە، بۆیە هیواو ئاواتی خواست کە حکومەت بە چاوێکی سۆز و بەزەییانەوە بڕوانێتە کێشەکە[٣٢].

دواتر لە ٢٢ شوبات گەیشتە بەغدا وە لەوێ لە هوتێلی شەتولعەرەب، دابەزی دواتر لە لایەن حکومەتەوە بەگەرمی پێشوازی لێکرا، چوونی بارزانی بۆ بەغدا دەرفەتێکی چاکی رەخساند بۆ ئەوەی لەوێ چاوی بەسەرانی پارتی هیوا بکەوێت، پاشان بارزانی چاوی بە وەصی و نوری سەعید کەوت. وە

کۆبونەوەیەکیان گرێدا، وە حکومەت بڕیاریدا ئەو خاڵانە جێ بە جێ بکات کە لەگەڵ ماجد مستەفا لەسەری ڕێکەوتبوون[٣٣].

لێرە سەرچاوەکان زانیاری تەواو دەربارەی ئەو چاوپێکەوتنانەی نێوانیان نالێت بەڵام بە دوور نازانرێت کە نوری سەعید ڕازیبوبێت کە هەندێ لەو پێشنیارانە جێ بە جێ بکات. لەو کاتەدا بارزانی لە بەغدا بوو کە حکومەت بڵاوی کردەوە کە بارزانی خۆی بە دەستەوە داوە بەبێ هیچ مەرجێك بەڵام نیازی مستەفا بارزانی بۆ ئەو سەردانە بۆ خۆ بەدەستەوەدان نەبوو هەروەك کریس کوچێرا دەڵێت: ((سەردانی بارزانی بۆ بەغدا لە سەردانێکی ڕەسمی دەچوو نەك بەمەبەستی سەردانوناندن بۆ حکومەت))[٣٤].

لەو کاتەی کە بارزانی لە بەغدا بوو هەندێك لە ناسیۆنالیستە عەرەبەکان لە ڕۆژنامە عەرەبیەکان وایان بڵاوکردەوە کە بارزانی و هاوڕێکانی بە چەکەوە لەسەر شەقامەکان هاتووچۆ دەکەن و ڕەخنەیان لە حکومەت گرت بۆیە حکومەت هەوڵیدا بارزانی دەستگیر بکات[٣٥]. بەڵام بارزانی دوای ڕێکەوتن لەگەڵ کاربەدەستانی پارتی هیواو نیشتمان پەروەرانی کورد لەوێ بڕیاریدا بەغدا بەجێ بهێڵێ و بگەڕێتەوە ناوچەی بارزان[٣٦].

سەردانی بارزانی بۆ بەغدا نەبووە هۆی ئارام کردنەوەی پەیوەندی نێوان حکومەت و بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی بەڵکو بە پێچەوانەوە بارودۆخەکەی زیاتر گرژ کرد وە دووبارە مەترسی هەڵگیرساندنەوەی شەڕی لێدەکرا، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ باوەڕ نەبوونەی هیچ لایەکیان بە ئەوەی تریان بە تایبەتی دوای ئەوەی بارزانی لە بەغدا بۆی دەرکەوت کە حکومەت نیازی گرتنی هەیە، هەروەها لە لایەکی تر ئەوەی زیاتر بارەکەی ئاڵۆزتر کرد هەنگاوەکانی

حکومەت بوو کاتێك فەرمانیدا بە کۆتایی هێنانی کاری ئەفسەرانی پەیوەندی دار لە ١٧ نیسانی ١٩٤٤[٣٧]. کاتێك ئەوانیش ئەمین ڕواندزی بۆی دانرا بچێتە سەربازگەی خۆی وە هەروەها سەعید عەزیز بچێتە خولێکی سەربازی، بەمەش زیاتر نیازی حکومەت گومانی تێکەوت[٣٨].

لێرەدا بە دیار دەکەوێت کە نوری سەعید نیاز پاك نەبوو لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد بە ڕێگەی ئاشتی، بەڵگەش لەسەر ئەوە زیاتر لە گفتوگۆی نێوان نوری سەعید و ماجد مستەفا بە دیار دەکەوێت، کە نوری سەعید دەیویست ئەوە بسەلمێنێ کە ئەم گرفتە گرفتێکی ناوەخۆییە، لە لایەکی تر نوری سەعید دەیویست بڵێ مەسەلەی بارزانی مەسەلەیەکی تاکە کەسی یە و نەوەك مەسەلەی نەتەوەیەك کە کوردە بەڵام ماجد مستەفا لێرەدا بە پێچەوانەی ڕایەکانی نوری سەعید پێی وابوو نابێ ئەو کێشەیە وەکو کێشەیەکی ناوەخۆیی سەیر بکرێت، چونکە بەم جۆرە تێڕوانینە کێشەکە چارەسەر ناکرێت وە ماجد پێ ی وابوو کە حکومەت هیچ کارێکی نەکردووە بۆ بەدەمەوە چوونی داواکاری کوردەکان[٣٩].

## پەراوێز و سەرچاوەکان

* ئەدرنە: شارێکە دەکەوێتە نزیك سنوری تورکیا و بلغاریا.

١- د. عثمان علی: دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة (١٨٣٢-١٩٤٦)، دراسة تأریخیة وثائقیة، مکتبة التفسیر، اربیل، ٢٠٠٣، ص٥٩٨.

٢- معروف جیاوك: مأساة بارزان المظلومة، ط٢، اربیل، ٢٠٠١، ل١٨٥.

٣- مسعود بارزانی: ثورة بارزان (١٩٤٣-١٩٤٥)، ص (١٧-١٨)

٤- حەسەن ئەرفەع: کوردەکان، لێکۆڵینەوەیەکی مێژووی سیاسی، وە/ سەردار محمد، چ١، سلێمانی، ٢٠٠١، ل١٧٣

٥- منذر الموصلی، رؤیة عربیة للقضیة الکردیة، القضیة الکردیة في العراق، البحث و الاکراد، دار المختار، ط١، دمشق، ٢٠٠٠، ل٨١.

٦- مسعود بارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل ٩١-٩٢.

٧- عزیز حسن بارزانی: الحرکة القومیة الکوردیة التحرریة في کوردستان العراق، ط ١، هەولیر، ٢٠٠٢، ل١٣٥.

* بسیتری: ئەم گوندە دەکەوێتە نزیك مێرگەسۆر، وە دەکەوێتە نێوان هێزەکانی بەرەی ڕواندز و بارزان.

٨- مسعود بارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٩٤-٩٥.

٩- سعاد رؤوف شیر محمد: نوری سعید و دورە فی سیاسە العراقیە حتی عام ١٩٤٥، مراجعە/ د. کمال مظهر احمد، گ١، بغداد، ١٩٨٨، ص١٨٨.

١٠- مسعود بارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٩٨-٩٩

١١- مسعود بارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨-٣١

١٢- عەلائەدین سوجادی: شۆڕشەکانی کورد، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٥٩، ل١٧٧.

١٣- حسن مصطفى: البارزانيون و حركات بارزان، ١٩٣٢-١٩٤٧، دار أناق العربيه، ١٩٨٣.

١٤- مسعود بارزانی: بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد ١٩٣٨-١٩٥٨، وە/سەعید ناکام، چاپخانەی خەبات، چ١، دهۆك، ١٩٩٨، ل ١٠٠.

١٥- عماد عبدالقادر محمد سعيد بريفكانى: نورى سعيد و المسألة الكردية، (ڤەژین) گۆڤار، ژمارە (١٤)، ساڵی چوارەم، چاپخانەی هەوار، ١٩٩٩.

١٦- عەلائەدین سوجادی: سەرچاوەی پێشوو ل١٧٨

١٧- عزيز حسن بارزانى: المصدر السابق، ص١٥٣.

١٨- مسعود بارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٠.

١٩- مسعود بارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠١، معروف جياوك: المصدر السابق، ص ١٢١.

٢٠- مسعود بارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٤.

٢١- فەیسەل دەباغ: حیزبی هیوا و شۆڕشی (١٩٤٣-١٩٤٥) بارزان، چاپخانەی ڕۆشنبیری، چ١، هەولێر، ١٩٩٧، ل٣٧.

٢٢- عزيز حسن بارزانى: المصدر السابق، ص١٥٥

٢٣- سعاد رؤوف شير محمد: المصدر السابق، ص ١٩٠.

٢٤- عبدالرزاق الحسنى: تأريخ الوزارات العراقيه، ج٦ ، ص٢٩١، عەلائەدین سوجادی: سەرچاوەی پێشوو ل١٨٢.

٢٥- كريس كوچيرا: كورد له سەدەی ١٩ و ٢٠ دا، وه/ محمد ريانى، تاران، ١٣٦٩ هەتاوی، ل٢١٨.

٢٦- محمد بريفكانى: چەند ڕاستیەکی مێژوویی دەربارەی بارزانیەکان، وە/ چەپەر، بغداد، ١٩٥٢، ل٢٣.

٢٧- تۆماس بوا، تأريخ الاكراد، ت/ محمد بشير ميرخان، دار الفكر، گ١، دمشق، ٢٠٠١، ص٢٠٦.

٢٨- محمود الدره، القضية الكردية، دار الطليعة، گ٢، بيروت، ١٩٦٦، ص٢٠٤.

٢٩- عەلائەدین سوجادی: سەرچاوەی پێشوو ل١٨٠.

٣٠- فەیسەل دەباغ: : سەرچاوەی پێشوو ل٤٠.

٣١- حسن مستەفا: المصدر السابق، ص٦٠.

٣٢- فەیسەل دەباغ: : سەرچاوەی پێشوو ل٤٢.

٣٣- عبدالفتاح على يحى البوتانى: وپائق عن الحركه القوميه الكورديه التحرريه، ملاحچات تأريخيه و دراسات اوعيه، مؤسسه موكريانى، اربيل، ٢٠٠١، ل ٥٣٢.

٣٤- - مسعود بارزانی: سەرچاوەی پێشوو،ل١٠٦.

٣٥- عزيز حسن بارزانى: المصدر السابق، ص١٧٩.

٣٦- كريس كوچيرا: سەرچاوەی پێشوو، ١٩٢.

٣٧- معروف جياوك: المصدر السابق، ص ١٢٥.

٣٨- - فەیسەل دەباغ: : سەرچاوەی پێشوو ل٤٣.

٣٩- عزيز حسن بارزانى: المصدر السابق، ص١٦٢

٤٠- مسعود بارزانی: سەرچاوەی پێشوو،ل١٠٦.

٤١– عزیز حسن بارزانی: المصدر السابق، ص١٦٢.

## سەرچاوەکان

### کوردیو عەرەبیەکان

١) د . عثمان علی : دراسات فی الحرکة الکوردیة المحاصرة ( ١٨٣٣–١٩٤٦ ) ، دراسات تاءریخیة وثائفیة ، مکتبة التفسیر ، اربیل ، ٢٠٠٣ .

٢) معروف جیاوك : مأساة بارزان المضلومة ، صفح الطبعة الثانیة ، اربیل ، ٢٠٠١ .

٣) مسعود بارزانی : البارزانی والحرکة التجریریة الکوردیة ، ثورة بارزان (١٩٤٥–١٩٤٣) کردستان ، ١٩٨٦

٤) حەسەن ئەرفەع : کوردەکان ، لێکۆڵینەوەیەکی مێژووی سیاسی ، وە / سردار محمد چاپی یەکەم ، سلێمانی ، ٢٠٠١

٥) منذر الموصلی : رؤیة العربیة للقضیة الکوردیة ، القضیة الکوردیة فی العراق . دار المختار ، الطبعة الاولی ، دمشق ، ٢٠٠٠

٦) عزیز حسن بارزانی : الحرکه الکوردیه التحریریه فی الکوردستان العراق الگبعه الاولی، هەولێر ، ٢٠٠٢

٧) سعاد رؤوف شیر محمد : نوری سعید ودوره فی السساسه العراقیه حتی عام ١٩٢٥ ، مراجعه د. کمال مضهر ، الطبعة الاولی ، بغداد ، ١٩٨٨ .

٨) علاء الدين السجادى : شۆڕشەکانی کورد ، چاپخانەی مەعاریف ، بغداد ، ١٩٥٥ .

٩) حسن مصطفى :البارزانيون وحركات بارزان ( ١٩٣٢ – ١٩٤٧ ) دار افاق العربيه ، الطبعة الثانية ، ١٩٣٨ .

١٠) مسعود بارزانی : بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد ( ١٩٣٨– ١٩٥٨) وە / سەعید ئاکام ، چاپخانەی خەبات / چاپی یەکەم ، دهۆك ، ١٩٨٨.

١١) عماد عبدالقادر محمد سعيد البريفكاني : نوری سعيد والمسالة الكردية ، ڤەژین گۆڤار ، ژمارە ((١٤)) ، ساڵی چوارەم ، چاپخانەی هەوار ، ١٩٩٩

١٢) عبد الفتاح علی يحيى البوتانی : وثائف عن الحركة القومية الكوردية التحريرية ، ملاحضات تاريخية ودراسات اولية ، مؤسسة موكريانی اربيل ، ٢٠٠١

١٣) عبد الرزاق الحسينی : تاريخ الوزارات العراقية ، ج ٦ ، بغداد ، ١٩٨٨.

١٤) كريس كوچيرا: کورد لە سەدەی ١٩ و ٢٠دا، وە/ محمد لايانی، تاران، ١٣٦٩ هەتاوی.

١٥) محمد بريفكانی: چەند ڕاستیەکی مێژوویی دەربارەی بارزانیەکان، وە/ چەپەر، بغداد، ١٩٥٣.

١٦) تۆماس بوا، تأريخ الاكراد، ت/ محمد بشير ميرخان، دار الفكر، ط١، دمشق، ٢٠٠١.

١٧) محمود الدرة، القضية الكردية، دار الطليعة، ط٢، بيروت، ١٩٦٨.

# نوری سەعید

ئوسامە جەمیل

تەوەرەی یەکەم :

لەم تەوەرەیە دا بە زەروری دەزانم باس لە مێژووی ژیان و کەسایەتی سیاسی نوری سەعید بکەم ، چونکە کە باس لە عێراق دەکرێت لە سەدەی بیستەمدا ، ئەوە دەبێت باس لەو پیاوەش بکرێت ، کە هەموو ژیانی خۆی بۆ سیاسەت و دەسەلات تەرخان کردبوو لە عێراقدا . . ئەم تەوەرەیە دەکەم بە دوو بەش :

بەشی یەکەم :

ناوی (نوری) یە کوڕی (سەعید) ئەفەندی کوڕی (شێخ صالح کوڕی مەلا تەها) ئەفەندیە ،لە ساڵی ١٨٨٨ لە شاری بەغدا لە دایك بوە ، لەبەر دەستی باوکی پەروەردە بووە ، پاشان چۆتە حوجرە و لای چەند مەلایەك هەندێ زانستی ئاینی قورئانی خوێندووە.

هەندێك لە نووسەران پێیان وایە ئەسڵی عەرەبە لە عەشیرەتی قەرەغولیە .(١) بەلام صلاح الدین الصباغ دەڵێت : نوری کوڕی سەعیدە ، دەشڵێن (السعید) ، بەلام عەرەب نییە و نە لە نەوەی سەعیدە و نە لە ئالی سەعیدە ، بەڵکو تورکە وخەڵکی قوینەیە .(٢) لە ساڵی ١٩٠٣ چۆتە کۆلیژی سەربازی لە ئەستەنبول ، لە ساڵی ١٩٠٦ بە پلەی ئەفسەر دەرچووە ، لە ساڵی ١٩١٠

چۆتە کۆلیژی ئەرکان کاتی بەریتانیەکان لە ساڵی ١٩١٤ بەسرەیان داگیر کرد و ئەو لە شاری بەسرە بوو ، بەڵام چونکە نەخۆش بوو، بۆ چارە سەری چوو بۆ هیندستان ، لەساڵی ١٩١٥ چووە بۆ میسر لەوێ لەگەڵ عەرەب و بەریتانیەکان کەوتە هاریکاری بۆ شۆرش کردن لە دژی دەسەڵاتی عوسمانی ، پاشان پەیوەندی بە ( شەریف حسین)ی ئەمیری مەککە کرد ، لە ساڵی ١٩١٨ – ١٩١٩ بوو بە سوپاسالاری ئەمیر ( فەیسەل کوری حسین) چالاکی سیاسی ( نوری سەعید) بۆ پێش شەڕێ جیهانی یەکەم دەگەڕێتەوە ، رۆڵێکی کاریگەری هەبوو لە دروست کردنی (( جمعیە العهد)) ، جگە لەوەی کە پایەیەکی پتەوی پێکهاتەی دەسەڵاتی شا (فەیسەل) بووە لە عێراقدا (٣) و خۆیی (جەعفەر عەسکەری) رۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لە وەلانانی (طالب النقیب) لە عێراقدا کە مونافسێکی بەهێزی فەیسەل بووە بۆ پاشایەتی لە عێراقدا و خاوەن هێز و دەسەڵاتێکی زۆریش بووە لە ناوچەی بەسرەدا .(٤)

لە ساڵی ١٩٢٠ چاوی بە (مستر بیل) دەکەوێت (بیل) لە راپۆرتێکدا کە بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیای بەرز کردۆتەوە بەم شێوەیە باس لە نوری سەعید دەکات ودەڵێت : ( ئەو کاتەی بینیم هەستم کرد هێزێکی گەورەیەو لەبەردەمماندایە ، یان دەبێت بەکاری بهێنین ، یانیش دەبێت ڕکابەرایەتیەکی قورسی لەگەڵدا بکەین) .(٥)

نوری سەعید لە هەموو ژیانیدا پەرۆشی پارە نەبووە ، بەڵام ئیجگار پەرۆشی دەسەڵات و کورسی وەزارەت بووە و تادواساتی ژیانیشی کاری بۆ کردووە .(٦) لە ژیانیدا (١٤) جار سەرەك وەزیران بووە ، لەگەڵ ئەوەی کە پیاوێکی سەربازی بووە و دەرچووی کۆلیژی سەربازی بووە ، بەڵام لە ژێر سێبەری شا

فەیسەلی یەکەمی شای عیراق هاتۆتە ناو سیاسەت و ئەوەندەی نەبردووە بۆتە سیاسەتمەدارێکی گەورەی عیراق و ناوچەکە، هەربۆیە بەریتانیاکان بە دیارترین سیاسەتمەداری ڕۆژهەلآتی ناوەڕاست ناوەزەدییان کردووە .

(ویندل ویلك)ی نوێنەری تایبەتی سەرۆکی ئەمریکی (فرانکلین رۆزلفت) بۆ ڕۆژهەلآتی ناوەڕاست بە زیرەکترین عەقلی ئەو سەردەمە ناوی دەبات .(٧)

لە ساڵی ١٩٣٠ پارتێکی سیاسی دامەزراند بە ناوی (حزب العهد) ، ساڵی ١٩٤٩ پارتێکی دیکەی دامەزراند بەناوی (حزب الاتحاد الدستوری) پێش ئەوەش لە ساڵی ١٩٤٦ لە ژێر چاودێری خۆی پارتی (الأحرار) دامەزراو هەرخۆشی پەیرەو و پرۆگرامی ناوخۆی ئەو حیزبەی نووسی .(٨)

گەرچی لەگەڵ فەیسەلی یەکەمدا جیاوازی هەبووە لە بیر و باوەڕدا بەلآم هەمیشە فەیسەلی بە ڕەشماڵێکی گەورە داناوە بۆ عیراق ، لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی لەگەڵ فەیسەل گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە بڵێت : تا فەیسەل لەسەر عەرشی عیراق بێت ، جارێکی دیکە سەرۆکایەتی وەزیران وەرناگرێت. .(٩)

لەگەڵ ئەەشدا مردنی فەیسەلی یەکەم کاریگەری لە نوری کرد و لە ناخەوە هەژاندی و ڕایگەیاند : لە دەست دانی ئەو پیاوە خاوەن ئەزموونە زۆرەی کارەکانی لێ دواخستین و ئەگەر ئەو بمایە ئەوا ئێمەش لەسەر هێز و توانای خۆمان دەماین .(١٠)

بەشی دووەم :

## نوری سەعید و کاری سیاسی و دواساتەکانی ژیانی

وەك پێشتر وتمان نوری سەعید لە ژێر سێبەری شا فەیسەلی یەکەمدا دەستی بە کاری سیاسی کرد ، کە فەیسەلیش مرد و غازی کوڕی بوو بە شای عیراق ، نوری بە هەمان شێوە بەردەوام بوو ، بەهەمان شێوە خۆی لە غازی نزیك کردەوە ، بەڵام کاتێك بیستی شا غازی بە نیازە کچی یاسین الهاشمی بخوازێ شێت و هار بوو ، چونکە ڕکابەرایەتیەکی توندی لەگەڵ هاشمیدا هەبوو، نزیك بوونەوەی هاشمی لە غازی سەرەتایەکە بۆ لە ناو چوونی خۆی ، بۆیە خۆیی و جەعفەر عەسکەری کەوتنە هاندانی ئەمیر عبدالله تا هانی غازی بدات ئەمیرە (( عالیەی )) ئامۆزای بهێنێ ، هەوڵەکەی سەری گرت و توانی یاسین الهاشمی دوور بخاتەوە .(١١)

نوری سەعید پیاوێکی بچوکلانە بوو ، بەلام بە هەیبەت بوو ، سەرجەم وەزیرەکان لێ ی دەترسان و لە قسەی دەرنەدەچوون ، تەنانەت ئەوکاتانەی سەرەك وەزیرانیش نەبووە ، سەرەك وەزیرەکان حسابیان بۆی کردووە و نەخشەی سیاسیان دا نەدەڕشت کە پێچەوانەی بۆچوونەکانی نوری بێت .(١٢)

لەو سالانەی دوایی پێش کودەتای (١٤ی تەمموز) ، پیری و نەخۆشی ڕووی لێ کردبوو ، پالی بە (٧٠) سالی دابوو ، گوێچکەشی گران ببوو ، بەلام ئەوەشی بۆ مرامی سیاسی بە کار دەهێنا ، بۆیە ئەگەر شتێکی بە دڵ نەبوایە دەیووت : گوێم لێ نیە .(١٣)

دوا ساتەکانی ژیانی بەخەم و پەژارە بردۆتە سەر ، تەنانەت متمانەی بە کەس نەماوە ، بگرە بە پیاوە هەر نزیکەکانی خۆشی ، بە تایبەتی دوای ئەوەی بێ

ئومێد بوو لەوەی کە ((صباح))ی کوڕی بتوانێ جێ ی بگرێتەوە .

وا بڕیار بوو ١٤/تەمموز/١٩٥٨ نوری سەعید لەگەڵ شا فەیسەلی دووەم و عبدالالە بەرەو تورکیا بەڕێ بکەون و لەگەڵ بەرپرسانی تورك کوببنەوە ، پاشان بچن بۆ ئیتالیا و لەوێ کەل و پەلی گواستنەوە و ژن هێنانی فەیسەل بکڕن ،(١٤) بەڵام لە بەرە بەیانی (١٤ی تەممون)دا تەققە لە دەور و بەری کۆشکی ریحاب و ماڵی نوری سەعید دەستی پێ کرد ، لەو کاتەدا خزمەتکارەکەی نوری هات و پێ ی ڕاگەیاند کە چەند هێزێکی سەربازی بینیوە و لە ڕێگاوە بەرەو ئێرە دێن ئەبینێ هێڵی تەلەفونەکەی بچراوە دڵنیا بوو کە تازە کار لە کار ترازاوە .(١٥) ، بۆیە هەر بەکراس و بیجامەکەی لە ماڵەوە هاتە دەرەوە و سورای بەلەمێکی بچوکلانەی بوو تا لە زێی دیجلە بپەڕێتەوە و خۆی بگەیەنێتە باڵوێزخانەی سویسری بەڵام کە بینی خەڵکێکی زۆر لەوێ کۆبوتەوە زانی بگاتە ئەوێ دەیکوژن ، بۆیە یەکسەر گەڕایەوە شوێنی خۆی و لەوێوە ڕایکرد بۆ ماڵی دکتۆر صادق البصام ،(١٦) لەوێشەوە مرتچی البصام دەیخاتە سندوقی ئۆتۆمبێل و دەیبا بۆ ماڵی ((حاجی محمود الاستربادی)) کە خێزانەکەی دەستە خوشکی خێزانەکەی نوری سەعید بووە ، بەڵام دوای تۆزێك گومان لە کوڕێکی حاجی محمود دەکات کە خەبەری لێبدا ، چونکە ڕادیۆ بڵاوی کردبوەوە هەرکەسێك نوری سەعید بە زیندوویی یان مردوویی بگرێت (١٠) هەزار دیناری عیراقی بە خەڵات پێ دەدرێت ، بۆیە لەگەڵ (بیبە)ی خێزانی حاجی محمود و خزمەتکارێکیان سواری تەکسیەك دەبن و بەرەو کازمیە بەڕێ دەکەون ، تا بچێت بۆ ماڵی شێخ محمد العریبی ، کە ئەندامێکی باڵای ئەنجومەنی ئەعیان بووە ، نوری سەعید لە تەکسی

دادەبەزێت و لە میوە فرۆشێك پرسیاریماڵەکە دەکات ، بەڵام میوە فرۆشەکە بێجامەکەی لە ژێر عەبا دەبینێت و لێ ی دەکەوێتە گومان ، بۆیە هاوار دەکات : ئەوەتا نوری سەعید بیکوژن ، چەند پۆلیسێك دەورەی دەدەن و دەبێت بە تەقەو نوری سەعید و بیبە دەکوژرێن .(١٧)

ئەگەر چی هەندێك پێیان وایە نوری سەعید بەخۆی خۆی کوشتووە ،(١٨) هەندێکی تر دەڵێن : ئەوەی نوری سەعیدی کوشتووە (عەریفێك) بووە لە هێزی ئاسمانی عیراقی و ناوی (خچێر صالح السامرائی) بووە ، کاتێ گومانی کردووە ئەوە نوری سەعیدە ، چووە بیگرێ ، بەڵام نوری دەمانچەی لێ راکێشاوە ، ئەویش دەمانچەکەی لێ سەندووە و کوشتویەتی ، پاشان مقدم ( وصفی گاهر ) کە یاوەری کۆنی نوری سەعید بووە ، بە خۆی وهێزیکەوە هاتووە و چەند فیشەکێکیی بە تەرمەکەی ناوە ،(١٩) پاشان تەرمەکەیان بردووە بۆ وەزارەتی بەرگری و پیاوانی شۆرش سەیریان کردووە ، دوایی لە گۆرستانی (باب المعظم) ناشتوویانە ، بەڵام دوای سێ رۆژ لە گۆرەکەی دەریان هێناوە و بە پەتێك بە دوای ئۆتۆمبیلەوە لە ناو جادەکانی بەغدا رایانکێشاوە تا لەت و پەت بووە و هیچی نەماوەتەوە ژێر خاك بکرێت .(٢٠)

تەوەرەی دووەم :

## نوری سەعید و ئەو وەزارەتانەی پێکی هێنا

نوری سەعید لە ژیانی سیاسی خۆیدا (١٤) جار وەزارەتی پێکهێناوە لە عێراقدا ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو پیاوە زۆرترین بەختی هەبووە لە پێك هینانی حکومەتدا و زۆرینەی لێکۆڵەرەوە سیاسیەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کەوا ئەو (١٤) جارە هەمووی بۆ شانسی خۆی ناگەڕێتەوە ، بەڵکو بۆ هێز و توانا و لێهاتوویی خۆی لە لایەك و ئەو پەیوەندیە پتەو و بە هێزەی کە لەگەڵ بەریتانیا هەیبوو لە لایەکی ترەوە دەگەڕێتەوە ،جگە لەوەش شا فەیسەلی یەکەم و عبدالالهی وەسی و فەیسەلی دووەم هەستیان دەکرد کە بەڕێوەبردنی کاروباری عێراق لەو قۆناغەدا پێویستیەکی زۆری بە پیاوێکی وەکو نوری سەعید هەیە .(٢١)

ئەو وەزارەتانەی پێکی هێناون لە نێوان ١٩٢٠– ١٩٥٨ بووە ، یەکەم وەزارەت کە پێکی هێناوە لە ٢٣ ی ئاداری ساڵی ١٩٢٠ بووە ، دوا وەزارەتیش کە (١٤)ەمین بووە لە ٣ی ئاداری ١٩٥٨ بووە و لە ١٤ی مایسی ١٩٥٨ دەستی لە کار کێشاوەتەوە بۆ ئەوەی وەزارەتی بەکگرتووی یەکێتی عێراقی و ئوردنی پێك بهێنێ .(٢٢)

بەریتانیا و شا فەیسەلی یەکەم هەرزوو حەزیان دەکرد پێك هێنانی وەزارەت یان حکومەت بە نوری سەعید بسپێرن ، بە حوکمی ئەوەی نوری جێگای متمانەی هەردوولا بوو و هەروەها هاوەڵێکی کۆنی شا فەیسەل بووە و هەر لە سەردەمی شۆرشی عەرەبیدا پشت و پەنای بووە و بە یەکەوە کاری گرنگیان ئەنجام داوە .(٢٣) . لە پێك هێنانی حکومەتی دیمەشقیش هەر بە یەکەوە بوون

، لەسەرجەم ئەو حکومەتانەی پێش خۆی کە دروست کـراوە لـە عیراقـدا ، نوری سەعید وەکو چاوێکـی
کراوەی فەیسەل چاودێری حکومەتەکانی کردووە .(٢٤)

ناکرێت لەم باسەدا بە دوور و درێژی باس لە هەر (١٤) حکومەتەکەی نوری سەعید بکەین ، چونکە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی دوور و درێژ هەیە ، بەڵام دەکرێت باس لە یەکەم کابینـە و دوا کابینـەی بکـەین لـە گـەڵ گرنگترین ئـەو ڕووداوە سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و ئابووریانـەی لەسـەردەمەکانی ئـەودا ڕوویداوە.

**بەشی یەکەم :**

**حکومەتی یەکەمی نوری سەعید :**

بەرواری دروست بون :٢٣ی ئاداری ١٩٣٠ .

بەرواری هەڵوەشاندنەوەی : ٢٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٢ .

دیارە کاتێك ناجی السویدی وازنامەی خۆی لە بەرواری ٢٣ ئاداری ١٩٣٠ پێشکەش بە شا فەیسەلی یەکەم کرد ، هەر ئەو ڕۆژە فەیسەل بەڕەزامەندی (سیر فرنسیس هەمفریز)ی جیٚ ی متمانەی بەریتانی داوای لە نوری سەعید کرد کەوا حکومەتی سیانزەمین لە عیراق دروست بکات .

فەیسەل لە نامەیەکدا کە ئاڕاستەی نوری سەعید کردبوو نوسـیبووی (لەبـەر ئەوەی جێگای دڵسۆزی ئێمەی و پـشت بـە زیرەکیـشت دەبەسـتین ، داواکـارم حکومەتی تازە پێك بهێنی ).(٢٥)

نوری سەعید لە هەمان ڕۆژدا کابینەی تازەی پێك هێنا و هەموو ئەو هاوڕێیانەی خۆی هەڵبژارد بۆ وەزراەتەکان کە لە ڕۆژگاری شۆڕشی عەرەبیدا فەرمانبەری کارگێڕی بوون لەگەڵ خۆیدا .(٢٦)

**ستافی وەزارەتەکەی بەم شێوەیەی خوارە بوو :**

١- نوری سەعید - سەرۆك وەزیران .

٢- جميل المدفعي - وەزیری ناوەخۆ .

٣- علي جودت - وەزیری دارایی .

٤- جمال بابان - وەزیری داد .

٥- جعفر العسكري- وەزیری بەرگری .

٦- جميل الراوي - وەزیری ئەشغال و گەیاندن .

٧- عبدالحسين الچلبي - وەزیری مەعارف.

نوری سەعید وەکو حکومەتەکانی پێش خۆی بەرنامەکاری خۆی ڕانەگەیاند ، بەڵکو لە نامەیەکدا کە ئاڕاستەی شا فەیسەلی یەکەم کرد بوو ، بەرنامەکاری خۆی تێدا نووسیبوو ، کە تیایدا جەخت لە سەر چەند خاڵێکی گرنگ دەکات ، کە هەندێکیان پەیوەندی بە ناوخۆی عیراق هەیە و ئەوانی دیکەش پەیوەندیان بە کاروباری دەرەوەی عیراق هەیە ، گرنگترین ئەو تەوەرانەی لە وناوەکەیدا هاتبوون ئەمانەن (٢٧) :

١- پەیماننامەی نوێ ، کەوا بەریتانیا و عیراق لە سەری ڕێك بکەون و بەریتانیا دان بەسەربەخۆیی عیراق بنێت و وعیراق ببێ بە ئەندام لە (عصبة الامم) .

٢- سـەرجەم کاروبارەکـانی عـێراق کەسـانی عێراقـی بیگرنەدەسـت و ئـەو بەریتانی و هیندیانەی کە لە عێراقدا کاریان دەکرد چ وەکو ڕاوێژکار یـان وەکـو فەرمانبـەر وردە وردە لـە کارەکانیـان دوور بخرێنـەوە و بگەڕێنـەوە بـۆ وڵاتـی خۆیان .

٣- باری ئابوری وڵات چاك بکرێت و گوزەرانی خـەڵك ، ڕوەو باشـە ببرێت و عێراق پشت بە کار و کارگەکانی خۆی ببەستی .

بۆ جێبەجێکردنی خاڵی یەکەم ، نوری سەعید حیزبێکی سیاسی دامەزراند بـە ناوی (حزب العهد)،(٢٨) تیایدا پاڵپشتی نوریَ سەعیدی دەکرد بـۆ مـۆرکردنی پەیماننامەی سەربەخۆیی عێراق دەست بەریتانیا ، نـوری دوای دان وسـتانێکی زۆر توانی ئـەم پەیماننامەیـە مـۆر بکـات و خاڵـەکانی دیکـە بـەردەوام بـوو لـە کارکردن .

بەڵام لە پێك هاتەی دووەمی حکومەتەکەیدا کـە لـە ١٩ی تـشرینی یەکـەمی ساڵی ١٩٣١.(٢٩) دایمەزرانـد ، کۆمـەڵێك کـاری ئەنجامـدا لەوانـە : گێڕانـەوەی دوور خراوەکانی شاری بەسرە بۆ شوێنی خۆیان کـە بـۆ ناوچـەی (عانـە) دوور خرابونـەوە لـە ئەنجامـدانی بەشـداریکردنیان لـە مانگرتنەکـەی سـاڵی ١٩٣١ ، جگەلـەوە ڕێگایـدا چـەندین ڕۆژنامـە کـە داخـرا بـوون دەسـت بـە بڵاوبوونـەوە بکەنەوە ، هەروەها سانسۆری سوك کرد.(٣٠)

جگە لەمە نوری سەعید توانی پەیماننامەیەکی گرنگ لەگەڵ تورکیا مۆر بکـات لە بەرژەوەندی عێراقدا ، ئەویش بەوەی توانی تورکیا بێنێتە ناو بازنەی عـێراق کاتێك کە لە تورکیا بـە وەزیـری دەرەوەی تورکیـای ڕاگەیانـد : ئـەو دەیـەوێت

پەیوەندی نێوان عیراق وئیتالیا خۆش بکات – لەو کاتە ئیتالیا دوژمنی گەورەی تورکیا بوو – تاوەکو ئیتالیا پاڵپشتی عیراق بکات بۆ بوون بە ئەندام لە (عصبة الامم). (٣١)

ئەمە وای کرد تورکیا پەیماننامەیەك لەگەڵ عیراق مۆر بکات ، تا عیراق بەلای خۆی رابکێشێت و لە ئیتالیا دوور بکەوێتەوە .(٣٢)

لە پەیمانامەکەدا لەگەڵ تورکیا لەسەر ئەوە رێك کەوتن کە تاوانباران تەسلیم بە یەك بکەنەوە بە چەند مەرجێك ، هەروەها پەیماننامەیەکی بازرگانیشیان مۆر کرد و ئەم پەیماننامەیە چەندین خاڵی دیکەی لە خۆی گرتبوو کە زۆربەی دەرژایە خانەی بەرژەوەندیەکانی عیراق ، ئەو کۆمەڵە کارانەی کە نوری سەعید ئەنجامیدا وای کرد کەوا شا فەیسەلی یەکەم رێزی لێ بگرێت ومیدالیای رافیدێنی پلەی دووی پێشکەش بکات لە جۆری مەدەنی لە ٢٦ی ئاداری ١٩٣٢ ، دەبێ ئەوەش بڵێین : لە سەردەمی نوری سەعید دا پارەی عیراقی لێدرا وعیراق بوو بە خاوەن دراوی خۆی ، لە کاتێکدا لەسەردەمی عوسمانی بە لیرەی عوسمانی مامەڵە دەکرا و کە بەریتانیا عیراقی داگیر کرد بە پارەی هیندی مامەڵە دەکرا ، بەلاّم لە ساڵی (١٩٣١) دراوی عیراقی کەوتە بازاڕ و خەڵك مامەڵەی پێ دەکرد .

هەر لە سەردەمی وەزارەتی دووەمی نوریدا شۆرشەکانی بارزان دەستی پێ کرد ، کە دوایی لە تەوەرەی سێ یەمدا بە درێژی باسی لێ دەکەین .

نوری سەعید لە ٢٧ ی تشرینی یەکەم ١٩٣٢ وازنامەی پێشکەش بە فەیسەلی یەکەم کرد و ئەویش ڕەزامەندی لەسەر دەربری ، ئەوەی کە دیار بوو ئەوەبوو نوری سەعید بە ڕەزامەندی خۆی دەستی لە کار کێشاوەتەوە ، بەلاّم

ئەو ڕاپۆرتە ژمارە ٣٣٥ لە ٢٩ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٢ کەوا (هیوبت همفریز )ی باڵیۆزی بەریتانیا بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی ناردووە ، ئەوە دەر دەخات کەوا نێوان فەیسەل و نوری بە تەواوی تێك چووبێت و فەیسەل متمانەی بە نوری نەما بێت و فشاری خستبێتە سەر تاکو وازبێنی .(٣٣)

تەنانەت کار گەیشتبووە ئەوەی نوری سەعید بە هەمفریزی وتبوو : تا فەیسەل لەسەر عەرشی عیراق بمێنێت ، ئەوا سەرۆکایەتی وەزیران وەرناگرێت (٣٤).

## بەشی دووەم :

دوا حکومەتی نوری سەعید :

دوا حکومەت کە نوری سەعید پێکی هێناوە ، حکومەتی (١٤)م بوو ، کە لە ٣ی ئاداری ساڵی ١٩٥٨ پێکی هێنا و لە ١٩ی مایسی ساڵی ١٩٥٨ وازنامەی پێشکەش کرد . ئەم حکومەتە پێك هات دوای ئەوەی فەیسەلی دووەم ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر هەڵوەشاندنەوەی حکومەتەکەی (عبدالوهاب مرجان) لە ٣ی ئاداری ١٩٥٨ هەر هەمان ڕۆژ مەرسومێکی شاهانەی ئاراستەی نوری سەعید کرد و داوای لێ کرد کەوا دەست بکات بە پێکهێنانی حکومەتێکی تازە .

ئەویش دەست بەجێ فەرمانەکەی فەیسەلی دووەمی جێ بە جێ کرد و لە شەشی هەمان مانگدا کابینەی تازەی ڕاگەیاند (٣٥)، نوری سەعید لە پێك هێنانی ئەم حکومەتە کۆمەڵێك گرفتی هاتە پێش لەوانە : چەندین کەسایەتی

سیاسی ناوداری ئەو کاتەی عیراقی وەك : ئەحمەد موختار بابان و ارشد العمری و عبدالوهاب مرجان ئامادە نەبوون بەشداری لەم حکومەتە بکەتن .

بۆیە نوری سەعید ناچار بوو ئەوکەسانە بەشداری پێ بکات کەوا لایەنگیریەکی رەهایان بۆ فەیسەل و عەرشەکەی هەیە .(٣٦)

دەکرێت بەراوردی ئەم وەزارەتە و وەزارەتی نوری لەم چەند خاڵە دا ئاماژە پێ بکەین :-

١- لە کابینەی یەکەمدا نوری سەعید لە هەرەتی گەنجیدا بوو ، خاوەن هێز و توانایەکی زۆر ، هیلاك نەدەبوو ، بەلآم لە کابینەی (١٤)دا پاڵی بە (٧٠) ساڵی دابوو هەروەها دووچاری نەخوشی ببوو ، جگە لەوەش گوێچکەی گران بوو .

٢- لەم کابینەیەدا نوری پاڵپشتی بە هێزی جارانی بەریتانیا ناما بو بەڵکو خەریك بوو بەریتانیا پشتی لێ دەکرد ، هەستیان دەکرد سەردەمی نوری تەواو بووە.(٣٧)

٣- ئەو پاڵپشت و هێز و توانایەی کە لە سیبیەکاندا لە ناو سوپای عیراقیدا هەیبوو ، رووی لە کزی کردبوو ، چونکە بزووتنەوەی ئەفسەرانی ئازادی خواز لە چڵەپۆپەدابوو ، بزافی نەتەوەی عەرەبیش گەیشتبووە لوتکە و عیراق لە سەروبەندی گورانکاریەکی چاوەروان کراودا بوو .(٣٨)

٤- فەیسەلی دووەم کەسایەتی لە چاو باپیری لاواز بوو ، هێشتا لە قۆناغی تا رادەیەك مێر منداڵی دابوو ، جگە لەوە عبدالالهی خاڵی تا ئەندزەیەك زۆر کونترۆڵی وەزعەکەی کردبوو ، نوری وعبدالاهیش بەینیان تەواو نەبوو .

٥- شەقامی عیراقی بە گشتی متمانەیان بە نوری سەعید نەمابوو ، چونکە رۆژ لە دوای رۆژ باری گەلانی عیراق خراپتر بوو ، بەرامبەر بەوەش چینی ئاغا

و ســەرەك عەشــیرەت و دەرەبــەگ لــە خێــر و بێــری عیراقیــان دەخــوارد و خەڵكیشیان دەچەوساندەوە .(٣٩)

٦- نوری سەعید لە نێوەندی سیاسی قورسایی خۆی لە دەست دابوو ، كەس متمانەی پێ نەدەكرد و كەمتر هاوكاریان دەكرد وەك ساڵەكانی سی یەكان .

كابینەی چواردەمی نوری لە (١٤) وەزارەت پێك هاتبوو لەگەڵ (٣) وەزیری بێ وەزارەت ، ئەگەر چی نوری هەوڵیدا حكومەتەكەی تۆكمە بێت بەلاّم لە ناوخۆ و دەرەوە لە ئاستی پێویست نەبوو .(٤٠)

هێشتا ئەم حكومەتە بەرنامەی كاری خۆی ڕانەگەیاندبوو ، كە بەرەیەكی نیشتیمانی بە هێز لە دژی نوری سەعید و حكومەتەكەی دروست بوو ، ئەم بەرەیە لە كۆمەڵێك حیزبی نیشتمانی پێك هاتبوون كە هەر هەموویان لە دژی نوری سەعید و حكومەتەكەی كاریان دەكرد ، لەو حیزبانەش :( حزب الاستقلال ، الحزب الوطني الديمقراطي ، حزب البعث العربي الاشتراكي، الحزب الشيوعي العراقي ). كار بەئەوە گەیشت ئەوەی نوێنەری ئەو بەرەیە عبدالالە ببینێت و داوای لێ بكات حكومەتەكەی نوری سەعید هەڵبوەشێنێتەوە و نوری بكاتە باڵیۆزی عیراق لە ئەمریكا و هەروەها پەیماننامەی بەغدا هەڵبوەشێنێتەوە ،(٤١) بەلاّم عبدالالە ئەو داوایەی ڕەت كردەوە .

نوری سەعید بۆ ئەوەی خۆی لەم گرفتانە رزگار بكات ، هەوڵی دا نێوەندی سیاسی بە یەككگرتنی هاشمی نێوان عیراق و ئوردن سەرقاڵ بكات ، بەلاّم ئەمە سەری نەگرت ، چونكە شەقامی عەرەبی عیراقی لەگەڵ ئەوە بوون عیراق لەگەڵ سوریا و میسر یەك بگرێت ، هەروەها كوردەكانیش دژی وەستان ،

چونکە ئەم یەکگرتنەیان بە هۆکارێکی سەرەکی توانەوەی کورد و کێشەکەی دەزانی .(٤٢)

بۆ ئەوەی یەکگرتنی عیراق و ئوردن سەربگرێت ، بانگهێشتی شا حسێنی ئوردن کرا و بە گەرمی پێشوازی لە خۆیی و وەفدی یاوەری کرا ، کۆمەڵێك دانیشتن لە نێوان هەردوو لا ئەنجامدرا و بڕیاریان دا ئەم یەکگرتنە سەربگرێت ، بەڵام دەبوایە ئەنجومەنی نوێ ڕەزامەندی لەسەر ئەم بڕیارە بدات و دەستکاری دەستور بکرێت ، ئەنجومەن ڕەزامەندی لەسەر دەربڕی و پاشان ئەنجومەن هەڵوەشایەوە و بڕیاردرا هەڵبژاردن بکرێت ، تا ئەنجومەنێکی تازە پێك بهێنرێت ، لەگەڵ ئەوەشدا نوری سەعید هەوڵی دا ڕەزامەندی بەریتانیا وەربگرێت بۆ ئەوەی (کوێت) یش بێتە ناو ئەو یەکگرتنە .(٤٣)

مەبەستی نوری سەعید لەوەدا بوو ، لەبەر ئەوەی (کوێت) وڵاتێکی دەوڵەمەندە بەشێکی زۆری گوزەرانی ئوردن بکەوێتە ئەستۆی ئەو ،(٤٤) بەلاًم بەریتانیا ڕازی نەبوو .

نوری سەعید لە بەرواری ١٤ی مایسی ساڵی ١٩٥٨ وازنامەی خۆی پێشکەش بە فەیسەلی دووەم کرد و ئەویش هامان ڕۆژ ڕەزامەندی لەسەر دەربڕی ، نوری خۆی ئامادە کرد تا ببێتە سەرەك وەزیرانی هەردوو وڵات ، لە ١٩ی مایسی ١٩٥٨ فەیسەلی دووەم بە نوسراوێکی فەرمی داوای لە نوری کرد کە حکومەتێکی یەکێتی عەرەبی پێك بهێنێت ، ئەگەر چی عیراق و ئوردن بە جیا هەریەك و حکومەتێکی خۆی هەبوو بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆ .

ئەوی عیراق فەیسەلی دووەم ، پێك هێنانی حکومەتی بە احمد مختار بابان سپارد و ئەویش حکومەتی تازەی پێك هێنا .حکومەتەکەی نوری پێك هاتوو ،

بەردەوام بوو تا شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ ، کە تیایدا نوری سەعید خۆی و جێگرەکەی و چەند وەزیرێکی کوژران و (عبدالکریم قاسم)ی سەرکردەی شۆڕش لە ١٦ی تەمووز ساڵی ١٩٥٨ لە بەیاننامەیەکدا یەکێتیەکەی نێوان عیراق و ئوردنی هەڵوەشاندەوە و کۆماری عیراقی دامەزراند .(٤٥)

تەوەرەی سێ یەم

**نوری سەعید وکێشەی کورد**

**بەشی یەکەم** :– شێخ ئەحمەد و دەست پێ کردنی شۆڕش

یەکێك لە کێشە دیار و بەرچاوەکانی عیراق کێشەی کوردە ، ئەم ولآتە هەر لە سەرەتای دروست بونیەوە لە ساڵی ١٩٢١ دوو چاری ئەم کێشەیە بۆتەوە و دەسەلآتدارانی عیراقی پێوەی سەرقاڵ بوون بە چاك بێت یان خراپ ، پێك هاتەی نەتەویی و ئاینی عیراق وایکردوە کێشەی زۆری بۆ دروست بێت و نەتوانێت بە ئاسانی چارەیان بکات و لێ یان دەربازبێت .

دەکرێت بڵێین : هەر لەگەڵ داگیر کردنی عیراق لە لایەن بەریتانیاکانەوە ، کێشەی کورد پێ نایە قۆناغێکی تر و بەرەو ئاقارێکی تر چوو ، شۆڕشەکەی شێخ مەحمودی نەمر لە مایسی ١٩١٩ لە دژی بەریتانیا کاردانەوەی ئەو زوڵمانە بوو کە بەریتانیا لە کوردی دەکرد ، هەر کە شۆڕشەکە دەستی پێ کرد شێخ ئەحمەدی بارزانی ،(٤٦) هاوکاری لەگەڵ شێخ مەحمود کرد و نامەی بۆ نارد و ژمارەیەك بە چەکداریشی بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا بارزانی ڕەوانەی

بەرەکانی شەڕ لە سلێمانی کرد، بەلاّم تا هێزەکە گەیشتە ئەوێ ، شۆرشەکە تەواو ببوو ، هەروەها شێخ مەحمودیش بە دیل گیرابوو ، وردە وردە شۆرشەکە لە دەڤەری سلێمانی پەلی هاویشت بۆ دەڤەری بارزان و ناوچەکانی تری شار هەولێر ، کە شێخ ئەحمەدی بارزانی لە سەرەتا ڕۆڵی کاریگەری بینی ، ئەگەرچی پێش ئەویش لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی شێخ عبدالسلام بارزانی شۆرشی بەرپا کردبوو(٤٧) ، شۆرشەکەی شێخ ئەحمەد پەرەی سەند و دیارە کاردانەوەی زوڵم و ستەمی حکومەتی عیراقی بوو ، سالاّنە بڕێك پارەی دیاریکراوی وەکو باج لە سەر شێخ ئەحمەد دا نابوو ، ئەم پارەیە برابۆوە وداهاتی شێخ زیاد و کەمیشی بکردایە ئەو بڕە پارەیە دەستکاری نەدەکرا (٤٨) ، دیارە ئەو کارانەی حکومەتی عیراقی وای دەکرد ، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕق و تورەیی شێخ ئەحمەد و هاوەلاّنی ڕوو لە زیاد بوون بکات و لە دژی حکومەت هەنگاوی تازە و زیاتر بنێن ، دیارە حکومەتی عیراقی بە نەخشە و فەرمانەکانی بەریتانیا بەم کارە هەڵدەستا و بەریتانیا هەر لە زووەوە بڕیاری لێ دانی شۆرشەکەی شێخ ئەحمەدی دابوو .

محمدامین زەکی کە ساڵی ١٩٢٩ وەزیری بەرگری عیراقی بوو دەڵێت : ژەنەڕاڵ (لوخ) کە ڕاوێژکاری وەزارەتی بەرگری عیراقی بوو ، فەرمانی بۆ نارد تا ئیمزا بکەم لەسەر لێدانی ناوچەی بارزانیەکان ، بەلاّم من ڕەتم کردەوە و ئەوکارەم نەکرد ، دیارە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بەریتانیا هیچ کاتێك لە گەڵ ئەوە نەبووە کێشەی کورد چارە سەر بکات و بگرە ئاگر و ئاسنیشی بە کار هێناوە ، تەنانەت هەندێك جار هەڵویستەکانی شا فەیسەلی یەکەم نەرمتر و باشتر بووە لە هەڵوێستەکانی بەریتانیا ،چونکە فەیسەل زۆر جار هانی

بەرپرسانی عیراقی داوە کە نەرم و نیان بن بەرامبەر بە کورد و کێشەکەی (٥٠).

شۆڕشی شێخ ئەحمەد بەردەوام بوو ولەو سەر و بەندەدا نوری سەعید نزیك بوو لە کێشەی کورد بە حوکمی ئەوەی لە یەکەم کابینەی حکومەتی عیراقیدا جێگری وەزیری بەرگری بوو ، هەروەها هاموشۆی نزیکی لەگەڵ کورد هەبوە و لەگەڵ جەعفەر عەسکەری وەزیری ئەو کاتەی بەرگری عیراق زاوا و خەزور بوون جگە لەوەش هەندێك ڕا هەیە کە دەڵێن : نوری سەعید کورد بووە .(٥١)

کاتێك لە ساڵی ١٩٣٠ نوری سەعید یەکەم وەزارەتی خۆی دامەزراند ، هێشتا ساڵێکی تەواو نەکرد بوو کە دیسان شۆڕشی بارزان سەری هەڵدایەوە و حکومەتی نوری سەعیدی خستە ژێر بارێکی قورسەوە ، لە ساڵی ١٩٢٩ شێخ ئەحمەد مەلا موستەفای ڕەوانەی موسل کرد بۆ ئەوەی لەگەڵ موتەسەریفی موسل قسە بکات و پێ ی ڕابگەیەنێت کە دەخوازێت هێزەکانی بەریتانی لە ناوچەی (بلە) بکشێنەوە و هێزێکی عیراقی بێتە شوێنی ، دیارە حکومەتی عیراقی بەسەرکردایەتی (عەقید بەرقی) کە برای (بەکر صدقی) بوو هاتە شوێنی .

بەڵام عەقید بەرقی (لە جیاتی ئارامی بۆ ناوچەکە بێنێت ، دەستی بە نانەوەی کێشە وگرفت کرد (٥٢)، هەربۆیە هانی برادۆستیەکانی دا تا هێرش بکەنە سەر ناوچەی بارزان ،

لە گەرمەی ئەم شەڕە دا ناجی شەوکەتی وەزیری ناوەخۆی عیراق داوای لە هێزی ئاسمانی بەریتانی کرد هاوکاریان بکەن و بە فرۆکە لە ناوچەکانی بارزان بدەن ، بەریتانیاش ڕەزامەندی دەربڕی ،(٥٣)شەڕ دەستی پێ کرد و عەقید

بەرقی بە هێزێکەوە لە ناوچەی بارزان نزێك بووەوە و داوای لە شیخ ئەحمەد کرد بێ قەید و شەرت خۆی تەسلیم بەهێزەکانی حکومەت بکات ، ئەویش هێرشێکی گەورەی کردە سەر هێزەکانی حکومەت و زۆری لێ کوشتن و بریندار کرد ، ئەوانی دیکەش هەلاّتن .(٥٤)

نوری سەعید بەم شکستەی زانی و داوای لە شا فەیسەل کرد ناجی شەوکەت لە وەزارەتی ناخۆ لابەرێت و گرفتەکەی خستە ملی ئەو ، بەلاّم ئەم کارە سەری نەگرت و ناجی لە شوێنەکەی خۆی مایەوە ، هەر لەم ساڵەدا واتە : ١٩٣٠–١٩٣١ نوری سەعید بڕیاریدا لەگەڵ (ماجد مستەفا) کە وەزیرێکی کورد بوو ، سەردانی ناوچەکانی هەولێر بکات و لە نزیکەوە ئاگاداری بارودۆخی ئەو ناوچەیە بێت،(٥٥) بەلاّم هەرکە گەیشتە هەولێر خەڵکی هەولێر سکالاّ نامەیەکیان ئاراستەی نوری سەعید کرد و تیایدا گلەییان لە کەمتەرخەمی حکومەت و گرانی بازاڕ کرد .

لە دوای ئەم سەردانە جۆرێك لە گۆڕانکاریەکی کاتی ڕویدا و ماجد مستەفا سەردانی شێخ ئەحمەد بارزانی کرد و داوای لێ کرد هاوکاری حکومەت بکات ، ئەویش بە نوێنەرایەتی خۆی مەلا مستەفا بارزانی ڕەوانەی بەغدا کرد و لەوێ چاوی بە زۆر لە بەرپرسانی عێراق کەوت ، لەسەرووی هەموویانەوە فەیسەلی یەکەم کە لە نێوەڕۆخوانێکدا کۆبونەوە و نوری سەعیدیش ئامادەی بوو .(٥٦)

بەلاّم ئەم حاڵەتە زۆری نەخایاند و شەڕ دەستی پێ کردەوە ، فڕۆکەکانی بەریتانی بە سەختی ناوچەکانیان تۆپ باران کرد ، شێخ ئەحمەد و هاوەلاّنی بەرەو تورکیا ڕۆیشتن و ناوچەکانیان چۆڵ کرد ، دوای ساڵێك تورکیا تەسلیمی عێراقی کردەوە ، بەلاّم حکومەتی عێراقی لە ساڵی ١٩٣٣ لە ژێر فشاری

بارزانیەکان شێخ ئەحمەدی ڕەوانەی ناوچەی بارزان کردەوە ،(٥٧) ئەم بارودۆخە هەروا بەردەوام بوو ، جار جار شەڕ دەستی پێ دەکردەوە و جارجاریش دەوەستا .

### بەشی دووەم

### مستەفا بارزانی وشۆڕشی کورد :–

لە ساڵی ١٩٣١ نوری سەعید هەوڵی ئەوەیدا عیراق ببێتە ئەندام لە کۆمەڵەی گەلان (عصبە الامم) ئەمەش پێویستی بەوە دەکرد عیراق بەرامبەر بە کوردەکان نەرمی بنوێنێت و هەندێك مافیان پێ ببەخشێت .

بۆیە نوری سەعید پێشنیازی کرد کەوا خوێندن لە ناوچە کوردیەکان بە زمانی کوردی بێت و کتێبەکان وەربگێردرێنە سەر زمانی کوردی و نوسراوە فەرمیەکانیش بە کوردی بێت ، دیارە فەیسەلی یەکەمیش بەم کارە ڕازی بوو ، هەروەها ئەنجومەنی نوێنەرانیش ڕەزامەندی دەربڕی ، بەڵام لە کۆتایدا سەری گرت ،(٥٨) دیارە ئەمەش هەنگاوێکی سەرەتایی چاك بوو بۆ کوردستان و دەستپێکی کاری باشی پێوە دیار بوو ، ئەگەرچی ئەم خاڵە لەبەرخاتری چاوی کورد نەبوو ، بەڵکو بۆ ئەوە بوو عیراق ببێتە ئەندام لە کۆمەڵەی گەلان .

ئەم بارودۆخە هەروا بەردەوام بوو – مستەفا بارزانی دوور خرابووەوە بۆ سلێمانی ، بەڵام لە ١٩٤٠/٧/١٢ شاری سلێمانی بەجێ هێشت و بەرەو ئێران بەڕێکەوت ، پاشان گەڕایەوە ناوچەی بارزان .

نوری سەعیدیش لە ١٩٤٣/١٢/٢٥ هەشتەمین حکومەتی خۆی پێك هێناو سێ وەزیری کوردی دانا کە ئەمانە بوون : ئەحمەد موختار بابان بۆ وەزارەتی

داد ،عومەر نەزمی بۆ وەزارەتی ناوخۆ ، ماجد مستەفا بۆ وەزیری دەوڵەت کە تایبەت بوو بە کێشەی کورد ، ماجد وەك نوێنەری نوری سەعید هات بۆ لای مستەفا بارزانی و داوای لێ کرد یارمەتی بدا تا لە کارەکەی سەرکەوتوو بێت ، بارزانی شەڕی ڕاگرت ، پاشان ماجد مستەفا چوو بۆ لای شێخ ئەحمەد لە حللە و داوای لێ کرد یەکێك لە کوڕەکانی بنێرێت بۆ لای مەلا مستەفا بارزانی تا لەگەڵ حکومەت ڕێك بکەوێت ، ئەویش محمد خالدی کوڕی ڕەوانە کرد ، بەلأم بە دوو کاتژمێر پێش گەیشتنی بۆ مێرگە سوری ژێری سەربازەکانی حکومەت تەقەیان لە پێشمەرگەکان کردبۆوە یەکێکیان شەهید کردبوو .(٥٩)

دیارە پێش ئەوەی ماجد مستەفا سەردانی بارزانی بکات بە یاوەری نوری سەعید سەردانی کوردستانیان کردبوو ، سەردانی شاری موسل و هەولێر و کەرکوکیان کردبوو نوری سەعید لە وتارەکانیدا ، ئاماژەی بەوە کرد کە دەیەوێت کێشەی کورد چارە سەر بکات و نەهێڵێت جارێکی تر سەر هەڵداتەوە و لەگەڵ بارزانیدا ڕێك دەکەوێت .. ئەو دەیووت : دایکم بە ڕەگەز کوردە و کوردم خۆش دەوێت ،(٦٠) پاشان بە ماجید مستەفای ووت : بڕۆ لەگەڵ بارزانی گفت و گۆ بکە و پێ ی بڵێ : دەبێت چەك و تەقەمەنیەکان بێ قەید و شەرت تەسلیم بە دەوڵەت بکاتەوە ،(٦١) ماجد سەرەتا بێ تاقەتی لەمە دەربڕی و کەوتە مشت ومڕ لەگەڵ نوری سەعید ، بەلأم لە کۆتاییدا بڕیاری دا گفت و گۆ لەگەڵ بارزانیدا بکات و بگاتە ئەنجامێك .

دیارە نوری سەعید لە ژێر فشاری بەریتانیەکان پێ یان ناخۆش بوو کێشەکە پەرە بسێنێت و گرفتیان بۆ دروست بێت ، جگە لەوەش جۆرێك لە جولە و گۆڕانکاری لە کوردستانی ڕۆژهەلأتدا بەڕێوە بوو ، کە بەریتانیەکانی

نیگەران کردبوو ئەگینا نوری ڕای بەرامبەر کوردەکان باش نەبوو ، بەڵکو هەمیشە لە هەوڵی سەرکوتکردنی شۆرش دابوو ، تەنانەت کاتێك محمود صبحي الدفتري کرد بە وەزیری دەرەوەی وەزارەتەکەی لەبەر ئەوە بوو چونکە هەردوو زمانی تورکی وفارسی دەزانی ، تا ڕاستەوخۆ قسە لەگەڵ ئێران و تورکیا بکات سەبارەت بە کوردەکان و داوایان لێ بکات سنور دابخەن لەبەردەم بارزانی و هاوەڵانی .(٦٢)

## دەست پێ کردنی دانوستان

ماجد مستەفا لە ١٩٤٤/١/٧ گەیشتە مێرگە سور وچاوی بە بارزانی کەوت ، پێشتر بارزانی لەگەڵ (حیزبی هیوا) داخوازیەکانی کوردیان تاووتوێ و ئامادە کردبوو ، کە خۆی لە ٩ خاڵ دەبینیەوە ، گرنگترینیان: پێك هینانی ویلایەتی کوردستان بوو لە لیواکانی (کەرکوك ، سلێمانی ، هەولێر و قەزا کوردیەکانی سەر بە پارێزگای نەینەوا) . هەروەها زمانی کوردی زمانی ڕەسمی بێت و دوور خراوەکان بگەڕێنەوە کوردستان و چەندین خاڵی دیکەی تایبەت بە باری ئابوری و ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی .(٦٣)

ماجد مستەفا گەڕایەوە بەغدا و هەر نۆ داواکاریەکانی پێشەکش بە نوری سەعید کرد ، ئەویش دوای تاوتۆیکردنی لەگەڵ ئەنجومەنی وەزیران بڕیارێکی (٨) خاڵیان دەرکرد ، کە تا ئەندازەیەك جیاوازی هەبوو لەگەڵ داواکانی بارزانی و حیزبی هیوا ، مەسعود بارزانی لە کتێبی (بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد ) دەڵێت : نازانم ماجد مستەفا ئەو بڕیارانەی بەدەست

پاکی گەیاندە بارزانی، چونکە ئەوە لەگەڵ ئەو خاڵانەی بارزانی دای بە ماجد جیاوازن . (٦٤)

بەڵام پێ دەچێت حکومەتی نوری سەعید سیاسەتێکی دووفاقیانەی هەبووبێت ، ئەوەی لە خاڵەکان بۆ کورد گرینگ بوو بێت ، گەڕانەوەی شێخ ئەحمەدی بارزانی بوو بۆ ناوچەی بارزان و دەرکردنی لێبوردنی گشتی بوو ، خاڵەکانی تر لە بەرژەوەندی حکومەتەکەی نوری سەعید بوو . نەك کورد .

بە هەرحاڵ لە ١٩٤٤/٤/٢٢ بارزانی بە یاوەری وەفدێك بەرەو بەغدا بە ڕێ کەوت و لەگەڵ وەصی و نوری سەعید و وەزیرە پەیوەندیدارەکان کۆ بۆوە (٦٥) ، هەر لەوێش بارزانی ئەو سەردانەی بە هەڵ زانی وسەردانی حیزبی هیوای کرد بۆ بینین و تاوتوکردنی چەند مەسەلەیەکی تایبەت بە ڕێکەوتنەکە .

هەر لەو ماوەیەدا ماجید مستەفا کۆمەڵێك سەرەك هۆزی کوردی بانگهێشتی کەرکوك کردوو داوای لە نوری سەعید کرد کە بێتە ئەوێ ووتارێك پێشکەش بکات ، دیارە ئەویش هات و مەدحی کوردی کرد و بەڵێنی دا پەیمانەکەی بەرامبەر بە کورد بێنێتە جێ ... بەڵام وەزیرە عەرەبەکانی حکومەتی نوری سەعید بەم هەنگاوە ڕازی نەبوون و گرفتیان بۆ نوری سەعید دروست کرد ، لەگەڵ چەندین گرفت وگرژی تر نوری سەعید ناچار بوو لە بەرواری ١٩٤٤/٤/١٩ وازنامەی پێشکەش بە عەبدالاهی وەسی کرد و هاوپێچ لەگەڵ وازنامەکەی ڕاپۆرتێکی درێژی دەربارەی کێشەی کورد و چۆنیەتی چارەسەرکردنی پێشکەش بە وەصی کردوە و بیروڕای خۆی سەبارەت بە کێشەی کورد نووسیوە و داوا دەکات کەوا حکومەتی عیراقی بە جیدی خەمی

ئەو کێشەیە بخوات ، تا لە لایەن ئێران و تورکیا ئیستیغلال نەکرێت بۆ فشار خستنە سەر حکومەتی عیراقی .

دیارە وەصی لە دوای مانگێك وازنامەی نوری سەعیدی قبولّ کرد و هیچ خەمیشی لە مەسەلەی کورد نەخوارد ، بە هەلّوەشاندنەوەی وەزارەتەکانی نوری وپێکهینانی وەزارەتی حەمدی پاچەچی و نەمانی ماجید مستەفا وەکو وەزیر هەنگاوەکان وەستان و گرفت و ئالۆزیەکە سەر لە نویّ سەری هەلّدایەوە (٦٦).

بارودۆخەکە دوای نەمانی نوری سەعید گرژ بوو ، بارزانی نامەیەکی ئاراستەی وەزیری ناوخۆی عیراقی و بالّیوزی بەریتانیا لە عیراق کرد ، بەلاّم هیچ هەنگاوێك نەهاویشترا و حکومەتی پاچەچی هێزێکی زۆری سوپای کۆ کردەوە و هێرشی کردە سەر ناوچەی بارزان و شەرێکی گەرم دەستی پیّ کردەوە ، حکومەت زیانێکی زۆری لیّ کەوت ، پالّپشتی بەریتانیا بۆ حکومەتی عیراقی وای کرد هێزی پێشمەرگە وردە وردە پاشەکشیّ بکات ، جگە لەوەش عەشیرەتی زێباری و شێخ رەشیدی لۆلان و چەندانی تر خیانەتیان لە بارزانی کرد (٦٧)

ئەمەش وای کرد بارزانی و هاوەلاّنی بەرەو ئێران هەلّکشێن دوای ئەوەی کە نامەیەکی بۆ قازی محمد ڕەوانە کردبوو ، بەم شێوەیە بارزانی و هاوەلاّنی لە ١٩٤٥/١٠/١١ گەیشتنە ئێران .

دەبێت لە کۆتایید بلّێین : کە نوری لە دوای ئەم ڕووداوانە شەش جاری تر حکومەتی پێك هێنا ، بەلاّم لەم شەش جارەدا هیچ هەنگاوێکی نەهاویشت بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد . باشترین بەلّگەش ئەوەیە : هەر لەو ڕۆژەی کە

بـارزانی و هـاوەڵانی ئـاوارەی ئێـران بـوون و پاشـان بـەرەو یـەکێتی سـۆڤێت ڕۆیـشتن و لـەوێ مانـەوە و نـەیتوانی بگەڕێتـەوە عـیراق ، تـا ڕوخـانی ڕژێمـی پاشـایەتی و کـوژرانی نـوری سـەعید لـە ئـەنجامی بـەرپا بـوونی شۆرشـی ١٤/تەمموزی/١٩٥٨ لەسەر دەستی عبدالکریم قاسم و هاورێکانی لە بزوتنەوەی ئەفسەرانی ئازادیخواز .

## کۆتایی

ناوەڕۆك و دوو تویی ئەم باسە ئەوە دەسەلمێنێت کە نوری سەعید یەکێك لە سیاسەتمەدارە هەرە گەورەکانی سەردەمی خۆی ، کە هەموو ژیانی بۆ کورسی دەسەلآت تەرخان کردووە و بەهەموو هەوڵێکی بۆ کورسی یەکەم بووە و قەت بە ئەرکی بجووك ڕازی نەبووە ، پیاوێك لە ژیانیدا (١٤) جار حکومەت پێك بهێنێت لە ولآتێکی وەکو عیراق کە کێشەی نەتەوەیی و مەزهەبی زۆری تێدایە هەقی خۆیەتی زۆر لەو باسە زیاتر و گەورەتری لەسەر بنوسرێت .

نوری سەعید هەمیشە لە هەوڵی ئەوە دابوو جێ پێ ی دیار بێت و بۆ ئەوەش قەت لە سێبەری بەریتانیا دوور نەکەوتۆتەوە ، چونکە قەناعەتی وابووە بە بێ بەریتانیا هیچی پێ ناکرێت وولآتێکی وەکو عیراق بە هیچ ناگات .

هەر بۆیە بە ئارەزووی ئەوان جولآوەتەوە و هەنگاوێکی نەهاویشتووە کە دڵی ئەوان برەنجێنێت ، بگرە لە کێشە ناوەخۆییەکانی عیراقیش پرس وڕای بەوان بووە و بۆ بەرژەوەندیەکانی ئەوان جولاوەتەوە ، ئەگەر چی زیانیشی پێ گەیشتبێت لە شەقامی عیراقیدا ، هەروا کاری کردووە ، بۆیە بەلای ئاسایی بووە ، کێشە ناوخۆییەکان وەك کورد یان مەسەلە ئابوریەکان و کۆمەلآیەتیەکان بجولێنێت بە فەرمانی ئەوان یاخود
هەر بەفەرمانی ئەوان بمرێت.

هەرکاتێك لە حکومەت بووبێت تەنها بۆ خۆی کاری کردووە ، لە هەر حکومەتێکیش نەبوایە ، ئەوا بە توندی دژایەتی دەکرد ، لەگەڵ ئەمەشدا لە مەسەلە گرنگەکان ڕۆڵی کاریگەری بینیوە ، هەر لە سەربەخۆیی عیراق لەبەریتانیا و تابوون بە ئەندامی کۆمەڵەی گەلان و کێشەی فەلەستین و

دامەزراندنی کۆمکاری عەرەبی و دەرەست کردنی یەکێتی نێوان عـیراق و ئـوردن ، جگە لە ڕاگرتنی هاوسەنگی لە مامەڵە کردن لەگەڵ ئێران و تورکیا دا .

کارەساتی نوری سەعید لەوەدابوو شتێکی وای نەکرد بۆ گـەلانی عـیراق کـە پێ ی ئاسودە و خۆش گوزەران بن ، بەڵکو گەلانی عیراق هـەر برسـی بـوون و گرفتیان هەر لە زۆر بوون دابوو ، بۆیە دیوارێکی کۆنکریتی پر لە ڕق لـە نێـوان نوری سەعید وگەلانی عیراق هەبوو ، ئەوەش وایکرد لە دواساتەکانی ڕووخانیدا گـەلانی عـیراق زۆر بـە تونـدی تۆڵـەی لێ بکەنـەوە و بـە دوای ئۆتومبیـل لـە شەقامەکانی بەغدا ڕایبکێشن .

لەمەی سەرەوە بۆمان دەر دەکەوێت کـە مێـژووی کەسـایەتیە سیاسـیەکان چەند گریفگە وهێندەی تـر پێویـستیان بـە لێکۆڵینـەوە و تیـشك خـستنە سـەر هەیە .

## پەراوێز و سەرچاوەکان

(١) احمد فوزی ، ١٢ رئیس وزراء لاپەڕە ٣١ .

(٢) مژکرات الشهید صلاح الدین الصباغ ، لاپەڕە ٢١.

(٣) سعاد رؤوف شیر محمد ، نوری السعید و دوره فی السیاسة العراقیة حتی عام ١٩٤٥، لاپەڕە ١٥

(٤) سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕە ٤٢

(٥) احمد فوزی ، ١٢ رئیس وزراء ، لاپەڕە ٣٢.

(٦) د.کمال مەزهەر ئەحمەد ، مێژوو ، لاپەڕە ٢٥٥ .

(٧) عبدالزاق الحسنی ، تأریخ الوزارات العراقیه ، بەرگی یەکەم لاپەڕە ٤٢.

(٨) لیث عبد الحسن الزبیدی ، ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ فی العراق ، لاپەره ١٧ .

(٩) سعاد رؤوف شیر محمد ، نوری السعید و دوره فی السیاسه العراقیه حتی عام ١٩٤٥، لاپەڕە ١٧.

(١٠)سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕە ١٧.

(١١)سعاد رؤوف شیر محمد ، نوری السعید و دوره فی السیاسه العراقیه حتی عام ١٩٤٥، لاپەڕە ١٧.

(١٢) احمد فوزی ، ١٢ رئیس وزراو ، لاپەڕە ٦٢.

(١٣) سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕە ٦٣.

(١٤) احمد فوزی ، ١٢ رئیس وزراو ، لاپەڕە ٦٩.

(١٥) صبحی عبدالحمید ، اسرار ثورة ١٤تموز١٩٥٨ فی العراق ،لاپەڕە ١٠٠.

(١٦) خلیل ابراهیم حسین الزوبعی ، اللغز المحیر عبدالکریم قاسم ، صعود ، لاپەڕە ٤٣ .

(١٧) احمد فوزی ، ١٢ رئیس وزراء ، لاپەڕە ٨٨.

(١٨) عبدالزاق الحسنی ، تأریخ الوزارات العراقیه ، بەرگی سێ یەم، لاپەڕە ٤٥.

(١٩) لیث عبد الحسن الزبیدی ، پورە ١٤ تموز ١٩٥٨ فی العراق ، لاپەرە ١٩٢.

(٢٠)احمد فوزی ، ١٢ رئیس وزراء ، لاپەڕە ٨٩.

(٢١) سعاد رؤوف شیر محمد ، نوری السعید و دورە فی السیاسە العراقیە حتی عام ١٩٤٥، لاپەڕە ١٥.

(٢٢) عبدالزاق الحسنی ، تأریخ الوزارات العراقیە ، بەرگی سێ یەم لاپەڕە ٥.

(٢٣) سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕە ٦.

(٢٤) هەمان سەرچاوەی ، لاپەڕە ١٧٦.

(٢٥) هەمان سەرچاوەی ، لاپەڕە ٦.

(٢٦) السید عبدالرزاق الحسنی تأریخ العراق السیاسی الحدیث،لاپەڕە ٢٢٧.

(٢٧) السید عبدالرزاق الحسنی تأریخ السیاسی الحدیث،بەرگی دووەم ،لاپەڕە ٢٢٨.

(٢٨) احمد فوزی ، ١٢ رئیس وزراء ، لاپەڕە ٣٢.

(٢٩) عبدالزاق الحسنی ، تأریخ الوزارات العراقیه ، بەرگی سێ یەم، لاپەڕە ١٦٢.

(٣٠)سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕە١٦٧.

(٣١) . سعاد رؤوف شیر محمد ، نوری السعید و دوره فی السیاسة العراقیه حتی عام ١٩٤٥، لاپەڕە ١٥.

(٣٢) ناجی شەوکەت ، سیرة وذکریات.

(٣٣) عبدالزاق الحسنی ، تأریخ الوزارات العراقیه ، بەرگی سێ یەم، لاپەڕە ٢٠٥.

(٣٤) سعاد رؤوف شیر محمد ، نوری السعید و دوره فی السیاسه العراقیه حتی عام ١٩٤٥، لاپەڕە ١٧.

(٣٥) عبدالزاق الحسنی ، تأریخ الوزارات العراقیه ، الجزء ١٠، لاپەڕە ٢٠٨.

(٣٦) سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕە٢٠٨.

(٣٧) احمد فوزی ، ١٢ رئیس وزراء ، لاپەڕە ٦٧.

(٣٨) حنا بطاطو . العراق ، ورگێرانی عفیف الرزاز ، بەرگی یەکەم لاپەڕە ٣٧٧.

(٣٩) لیث عبد الحسن الزبیدی ، ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ فی العراق ، لاپەرە ١٠٣.

(٤٠)حنا بطاطو . العراق ، ورگێرانی عفیف الرزاز ، بەرگی یەکەم لاپەڕە ٢٢٠.

(٤١) صبحی عبدالحمید ، اسرار ثورة ١٤تموز١٩٥٨ فی العراق ،لاپەڕە ١٠١.

(٤٢) لیث عبد الحسن الزبیدی ، پوره ١٤ تموز ١٩٥٨ فی العراق ، لاپەرە ٨٩.

(٤٣) عبدالزاق الحسنی ، تأریخ الوزارات العراقیه ، الجزء ١٠، لاپەڕە ٢٢٣.

(٤٤) هەمان سەرچاوەی ، لاپەڕە ٢٢٤.

(٤٥) صبحی عبدالحمید ، اسرار ثورة ١٤تموز١٩٥٨ فی العراق ،لاپەڕە ١٠١.

(٤٦) مەسعود بارزانی ، بارزانی و بزوتنەوەی رزگاری کورد ،بەرگی یەکەم ، لاپەڕە ٢٢.

(٤٧) السید عبدالرزاق الحسنی تأریخ السیاسی الحدیث،بەرگی سیێ یەم ،لاپەڕە ١٨٥.

(٤٨) سەرچاوەی پێشوو ،بەرگی ٣ ، لاپەڕە١٨٥ .

(٤٩) سەرچاوەی پێشوو ،بەرگی ٣ ، لاپەڕە١٨٧ .

(٥٠)د. فاضل البراك، مصطفی البارزانی ، الاسطورة والحقیقة ،لاپەڕە ٢٩

(٥١) احمد فوزی ، ١٢ رئیس وزراء ، لاپەڕە ٣١.

(٥٢) مەسعود بارزانی ، بارزانی و بزوتنەوەی رزگاری کورد ،بەرگی یەکەم ، لاپەڕە ٢٥.

(٥٣) السید عبدالرزاق الحسنی تأریخ السیاسی الحدیث،بەرگی سیێ یەم ،لاپەڕە ١٨٧.

(٥٤) سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕە٢٦ .

(٥٥) د. اسماعیل شکر ، اربیل ،دراسة تأریخیە فی دورها السیاسي والفکري ١٩٣٩ –١٩٥٨ ، لاپەڕە ٤٦٥.

(٥٦) فؤاد عارف . مذکرات فؤاد عارف ، بەشی یەکەم ، لاپەڕە ٢٣٢.

(٥٧) مەسعود بارزانی ، بارزانی و بزوتنەوەی رزگاری کورد ،بەرگی یەکەم ، لاپەڕە ٩٩.

(٥٨) السید عبدالرزاق الحسني تأریخ السیاسي الحدیث،بەرگی سیێ یەم ،لاپەڕە ١٢ – ١٣.

(٥٩) مەسعود بارزانی ، بارزانی و بزوتنەوەی رزگاری کورد ،بەرگی یەکەم ، لاپەڕە ١٠٠.

(٦٠) کریس کوچیرا ، کورد لە سەدەی ٢٠ – ١٩ دا ، لاپەڕە ٢٣٠ .

(٦١) سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕە٢٣٠ .

(٦٢) سعاد رؤوف شیر محمد ، نوری السعید و دوره فی السیاسة العراقیة حتی عام ١٩٤٥، لاپەڕە ١٨٩.

(٦٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، بەرگی یەکەم ، لاپەڕە ١٠١.

(٦٤) مەسعود بارزانی ، بارزانی و بزوتنەوەی رزگاری کورد ،بەرگی یەکەم ، لاپەڕە ١٠٥.

(٦٥) د. اسماعیل شکر ، اربیل ،دراسة تأریخیە فی دورها السیاسي والفکري ١٩٣٩ –١٩٥٨ ، لاپەڕە ٢١٥.

(٦٦) السید عبدالرزاق الحسنی تأریخ السیاسی الحدیث،بەرگی شەشەم ،لاپەڕە١٩٨.

(٦٧) کریس کوچیرا ، کورد لە سەدەی ٢٠ – ١٩ دا ، لاپەڕە ٢٣٣ .

# هەولێر لە سەردەمی داگیرکردنیدا ١٩١٨-١٩٢٠

م . مهدی محمد قادر

## بەشی یەکەم

### ڕەوشی سیاسی هەولێر لە سالانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا

( ١٩١٤ – ١٩١٨ )

هەولێر لە سیستەمی کارگێڕی دەولەتی عوسمانی یەکێك بووە لە قەزاکانی سەر بە سنجەقی شارەزوور وئەویش سەر بە ویلایەتی موسل بووە [١] ، هەروەها بەشێك بووە لە ناوچەکانی باشووری کوردستان ( ئەمڕۆ بە کوردستانی عێراق ) ناو دەبردرێت ، لە سالانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٩١٤ــ١٩١٨) بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ مەیدانی ململانێی هێزە شەڕکەرەکان نەبوو ، بەلام کاریگەری جەنگ بە سەر ژیانی ئابووری وکۆمەلایەتی شارەکەوە هەبوو وەك زۆربەی ناوچەکانی تر لە کوردستان.[٢]

دەولەتی عوسمانی دوای ڕاگەیاندنی شەڕ لە دژی لە ٢ی تشرینی دووەمی ١٩١٨ شان بە شانی هێزەکانی ( ولاتانی میحوەر) شەڕی دژی ولاتانی هاوپەیمان ڕاگەیاند [٣] ، دوای ئەوەی ئاگری شەڕەکەش بەشێکی فرەوانی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی گرتەوە ، کەوتنە بە کار هێنانی شێوازی جۆراو جۆر بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هێزەکانی هاوپەیمانان ، سولتان

(محمد رەشادی پێنجەم ) لە بەیاننامەیەکدا کە ئاراستەی میر و زانایانی موسڵمانان و سەرۆک هۆز وخێڵەکان وسەرجەم دانیشتوانی ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانی دەکات داوایان لێدەکات بۆ جیهاد کردن و ئەم جەنگەش بە دەرفەتێك دادەنێت کە هاتۆتە پێش موسڵمانان و نابێت لە دەست خۆیانی بدەن. (٤)

دەکرێت بڵێین راگەیاندنی (جیهاد) لە روانگەی ئاینیەوە سەرچاوەی گرتووە ، بۆیە توندراوە سوود لەم شێوازە وەربگیرێت سەبارەت بە کوردیش بەشداریان لە شەرەکە کردووە ، سەبارەت بە خەلکی هەولێریش لە ژێر سەرکردایەتی ( شێخ محمودی حەفید ) بەشدارییان لە شەری شوعێبە لە خوارووی عێراق کردووە(٥) ، هەروەها کاتێك سوپای روسیا لە ژێر فەرماندەی (چیوەرنزوبوف ) دەگاتە ناوچەکانی رەواندوز(٦) ، سەرکردەی سوپای عوسمانی (عەلی ئیحسان پاشا ) دێتە هەولێر وپێشوازی لێدەکرێت وژمارەیەك لە ناوداران وخەلکی شاری هەولێر وئاغاکانی دزەیی لەمانەش (ئەحمەد پاشای دزەیی) ئامادەیی خۆیان پیشاندا بۆ رووبەروو بوونەوەی سوپای رووس (٧)، (بەلام مانەوەی هێزەکانی رووس لە ناوچەکە درێژەی نەکێشا بە هۆی بەرگری دانیشتوانی ناوچەکەو روودانی شۆرشی ئۆکتۆبەر لە سالی ١٩١٧ کە بووە هۆی کشانەوەی رووسیا لە شەرەکە (٨) ، هەروەها لە هەولێر( حاجی رەشید ئاغا )* فەوجێك لە خەلکی هەولێر وگوندی تەرجان پێك دەهێنێت بۆ بەرگری کردن لە دژی ئینگلیزەکان ئەم فەوجەش ناونراوە ( فەوجی شەمامك ) ،هەروەها هەندێك لە ناودارەکانی هەولێر و خێزانەکانیان کە باری ئابوورییان زۆرباش بووە ئامادە بوونە کە چەك بکرن بۆ ئەو کەسانەی کە ئامادەی ئەوەن

بچنە بەرەكانی شەڕ لە دژی ئینگلیز [٩] ، جێگای ئاماژەیە كە ئەو كەسانەی بەشدارییان لە شەڕی دژ بە ئینگلیز كردووە نازناوی (غەزایی ) یان پێوەتراوە بۆ نمونە ( مستەفا غەزایی) كە خەڵكی گوندی قولتەپەی ڕەشید بووە بەشداری شەڕەكەی كردووە و دواتر بەم ناوە ناسراوە [١٠].

دەوڵەتی عوسمانی لە شارەكانی كوردستاندا پەیڕەوی سیاسەتێكی زۆرە ملێیان كردووە كە لە كردەوەی دەوڵەتێك دەچوو كە لە سەر خاكی دوژمنانی ئەنجامی بدات [١١] ، هەولێریش بەدەر نەبووە لەم سیاسەتەی عوسمانیەكان وخەڵكیان بە زۆر دەبرد بۆ بەرەكانی شەر وئەوەی سەرپێچی بكردایە سزایان دەدا [١٢] دەكرێت بلێین ئەم هەڵوێستەش لە دوای ڕوودانی كودەتای ئیتحاد وتەرەقی لە ساڵی ١٩٠٨ لە ناو دەوڵەتی عوسمانیدا بە ڕوونی پەیرەو كرا ، چونكە پەیرەو كردنی سیاسەتی نەتەوە پەرستی لە دەوڵەتی عوسمانیدا دوای هاتنی ئیتحادییەكان بە ئاشكرا دەركەوت .

سەبارەت بە ڕۆڵی مەلا وشێخەكانی كورد ، بە تایبەتی ئەوانەی كە لە ڕاستیدا لە سیاسەتی ئەستەمبوڵ دوور بوون تەنها لە باری سەرنجی ئاینیەوە سەیری شەڕەكەیان دەكرد بانگەشەی جیهادیان دەكرد ، بەڵام ئەوانەی كە لە سیاسەتدا دوور نەبوون هەستی نارەزاییان بەرامبەر ئەم جۆرە فتوایانە دەردەبری بۆ غەزاكردن چونكە پێیان وابوو كە ئەم شەڕە لە سەر ڕاستی نیە [١٣].

دەتوانین بلێین لە ساڵانی جەنگدا هەستی هۆشیاری سیاسی لە هەولێردا سست بووە بە هۆی نەبوونی هیچ پارتێكی سیاسی لە شارەكە كە خاوەن پەیرەوپرۆگرامێكی نیشتمانی و نەتەوەیی بێت ،بە پێچەوانەی ناوچەكانی تر

لە کوردستان کە چەند پارت وڕێکخراوی سیاسی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم تێدا دامەزراوە[١٤] ، بۆیە دەکرێت بلێین لە بواری ڕێکخراوەیی سیاسییدا لەم ماوە مێژووییەدا ڕۆڵی نەبینیوە ، بەلام سەبارەت بە بەشداری بوونی خەلکی هەولێر لە جولانەوەی سیاسی ڕۆلیان گێراوە.[١٥]

•

## داگیرکردنی هەولێر لە لایان ئینگلیز

## ١٠ ی تشرینی دووەمی ١٩١٨

شەری یەکەمی جیهانی ( ١٩١٤ ـــ ١٩١٨ ) دوای ڕێکەوتنامەی (مۆدرۆس) لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨ بە سەرکەوتنی هاوپەیمانەکان کۆتایی هات [١٦]، کە لە ئاکامیدا هێزەکانی هاوپەیمانەکان دەستیان گرت بە سەر ناوچەیەکی فراوان کە لە ژێر دەسەلاتی دەولەتی عوسمانیدا بوو ، دوای داگیر کردنی شاری بەغدا لە ١١ی ئاداری ١٩١٧[١٧] ، هێزەکانی هاوپەیمانان ناوچەکانی کوردستانیان داگیر کرد[١٨]، بەلام دوای ڕاگەیاندنی ئاگر بەست هێزەکانی ئینگلیز لە ٨ی تشرینی دووەمی ١٩١٨ شاری موسل درا بە هاوپەیمانەکان و(عقید لجمن ) کرا بە حاکمی سیاسی شارەکە[١٩] .

سەبارەت بە داگیرکردنی هەولێر ، دوای ئەوەی هێزەکانی هاوپەیمانان گەیشتنە ( التون کوبری ) ، پاشماوەکانی سوپای عوسمانی لە شاری هەولێر پاشەکشەیان کرد بەرەو دیار بەکر بە ڕێگای ( هەولێر – موسل ) وبەشێکی کەمیان مایەوە ، چونکە دوای داگیر کردنی شاری کەرکوک (کابتن نویل ) حاکمی سیاسی کەرکوک هەوالی گەیشتنی هێزەکانی گەیاندە سەرۆکی

شارەوانی هـەولێر ( ئەحمـەد عوسمـان )[٢٠] . دەتـوانیین بلـێین هـۆی ئاگـادار کردنەوەی سـەرۆکی شـارەوانی لـەوەوە سەرچـاوەی گرتبێـت کـە لـەم کاتـەدا بەرپرسـانی عوسمانیـەکان لـە شـارەکە نـەماون و سـەرۆکی شـارەوانی وەك بەرپرسی یەکەم لە شارەکەدا هاتووە .

دوای بلاوبوونەوەی هەوالی گەیشتنی هێزەکانی ئینگلیز بە کەرکوك وهاتنیان بۆ هەولێر لە ناو خەلکدا، نـاودارانی هـەولێر وسـەرۆك خیلـەکانی دەوروپـشتی هـەولێر بـە مەبەسـتی وەرگرتنـی هەلوێـستێکی یـەکگرتوو لـەم بارودۆخـەدا کۆبوونەوە ، دوای گفتوگۆ کردن سەبارەت بە بیرۆکەی بەرگری کـردن لـە دژی ئینگلیزەکان ، دوو بیروڕا دەرکەوتن کە یەکەمیان لەمەوە سەرچاوەی دەگـرت کە هێزەکانی عوسمانی لە شارەکە کشاونەتەوە و خـەلکی هـەولێر لـە توانایـدا نیە کە بەرگری هێزێکی وەك ئینگلیز بکات وئەوەیان پەسەند کرد کـە بـەرگری نەکەن بۆ ئەوەی شارەکەش لە کاولکاری رزگاری ببێت ، بەلام بـیروڕای دووەم وایان دیار خست کە هەلوێستی بەرگری لە دژی هاتنی ئینگلیزەکان وەربگرن ، بەلام زۆربەی ئامادەبووان لە سەر ئەوە کۆك بـوون کـە بـەرگری نـەکرێت بۆیـە ئەم رایەیان پەسەند کرد[٢١] .

بە مەبەستی هاتنی ئینگلیزەکان بۆ هەولێر و وەرگرتنـی کاروبـاری شـارەکە ودەرچـوونی پاشمـاوەی هێزەکـانی عوسمـانی تێیـدا کـە رێژەیـەکی کـەم مابوونـەوە ، سـەرکردەی هێـزی سـەربازی ئینگلیـز لـە کـەرکووك یاداشـتێکی نوسراوی لە رێگای کابتن ( های ) رەوانەی هـەولێر کـرد کـە لـە کـاتی هاتنیـدا هیچ هێزێکی سەربازی لە گەلدا نەبوو تـەنها ئەفسەرێکی بـەریتانی لـە (وحـدە

الخياله/١٢ ) ئەندازەیی و دوو فەرمانبەری گەیاندنی بەریتانی نەبێت [٢٢] ، لەم بارەیەوە کابتن (های) سەبارەت بە چۆنیەتی هاتنی بۆ هەولێر دەڵێت :

**"...سەرەتا نزیك بووینەوە لە هەولێر لە ڕێگایەکی هەڵەوە ... دوای ئەوەی گەیشتینە هەولێر سەرەرای نالەباری کەش وهەوا خەلکێکی زۆر وجەندرمەکان هەموویان ڕیزیان بەستا بوو و ئامێرەکەیان یەکەم کەس بوو بە خێر هاتنی کردین ودواتر سەرۆکی شارەوانی پێشوازی کردین وسەربازەکانیش لە شێوەی سلاو وەرگرتنەوەدا بوون ... دواتر بەرەو سەرای چووین کە لەم شوێنە دیمەنێکی جوانی شارەکە دەبیندرا ... "** [٢٣].

بەمجۆرە دوای گەیشتنی ( های ) پێشوازی لێکردنی لە لایان هەندێك لە خەلکی هەولێر وسەرۆکی شارەوانی لە هەمان ڕۆژی گەیشتنیدا یاداشتەکە دەگەیەنێتە سەرکردەی سوپای عوسمانی لە سەربازگەی تورك کە دەکەوتە ڕۆژئاوای شاری هەولێر و ئاگاداری دەکاتەوە کە دەبێت شارەکە بەجێبهێلێت دوای ڕەزامەندی سەرکردەی سەربازی تورك بە پێی ڕێکەوتنی ئاگر بەستی مۆدرۆس هەولێر تەسلیم بە ئینگلیزەکان دەکات ، بەلام داوای ئەوە دەکات کە نەخۆشەکانیان ڕێگا پێبدەن بۆ ماوەکی کاتی لە هەولێر بمێننەوە ، سەرەتا ئینگلیزەکان رازی نابن بەلام دواتر داوا دەکەن کە پزیشکێکی خۆیان لە گەلیان بمێنێتەوە .دوای وەرگرتنی شارەکە لە تورك کۆگاکانی دانەوێلە درا

دەست ئینگلیزەکان کە رێژەیەکی زۆری ( گەنم وجۆ ) ی تێدا بوو و کاروباری حکومەت لە شارەکە تەسلیم بە ئینگلیزەکان کرا[٢٤].

دوای جێبەجێ کردنی ئەرکی وەرگرتنی شارەکە کابتن ( های ) لە ١١ی تشرینی دووەمی١٩١٨ لە بالەخانەی قائمقامیەت ( سەرای ـــ دار الحکومە ) [٢٥] کۆبوونەوەیەکی لە گەل ناودارەکانی هەولێر کرد ودەربارەی رەوشی شارەکە وهاتنی هێزەکانی ئینگلیز لە گەلیان دەدوێت ،لە رۆژی ١٣ ی تشرینی دووەمی ١٩١٨( نەقیب مۆری ) دەگاتە هەولێر وئەرکی یاریدەدەری حاکمی سیاسی لە هەولێر پێ دەسپێردرێت[٢٦] ، بەمجۆرە قۆناغێکی نوێ لە مێژووی شاری هەولێر لە دوای کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤ـــ١٩١٨) دەست پێدەکات .

## هەولێر لە سەردەمی فەرمانرەوایی ئینگلیزدا

دەسەلاتی ئینگلیز لە هەولێر بە دوو قۆناغ تێپەری ، یەکەمیان هاتنی کابتن ( های )و وەرگرتنی شارەکە لە لایان تورك ودووەمیان بریتی بوو لە هاتنی نەقیب ( مۆری ) دەست بەکار بوونی وەك جێگری حاکمی سیاسی لە شارەکە ، هەروەها لە سەرەتای داگیر کردنی هەولێر جەختیان لە سەر ئەوە کردەوە کە بارودۆخی شارەکە بە ئارامی بروات لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان[٢٧] ، بە مەبەستی هێنانە کایەوەی ئەم ئامانجەش هەولیانـدا کە سەرۆك عەشیرەتەکان بە لای خۆیان راکێشن لە رێگای پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان لە سەر حسابی بەرژەوەندی گشتی خەلکەکە[٢٨]. وەك لە بەلگەنامەکانی

عوسمانیدا دەردەکەوێت ئینگلیزەکان بە مەبەستی جێگیر کردنی دەسەلاتیان بری (١٧٠ روپیە )* تەرخان دەکەن بۆ ئەو سەرۆک عەشیرەت وناودارانەی هەولێر کە لە گەل حوکمرانی ئینگلیزەکاندا بوونە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان [٢٩]،هەروەها بۆ پاراستنی ئاسایشی شارەکە پشت بەم پۆلیسانە دەبەستێت کە لە ژێر فەرماندەی (مستر روبنز ) دا بوونە ژمارەیان (٣٥) پۆلس بووە ، لە لایەکی تریش خەریکی مەشق پێکردنی نزیکەی ( ١٥٠ ) کەسی تر بووە لە لایان عەریف (کینارد ) ، کە دواتر ئەم ئەرکە دەدرێت بە عەرەبێکی سوری بە ناوی ( سید علی افندی ) [٣٠]. جێگای ئاماژەیە کە ئینگلیزەکان هەر لە سەرەتای هاتنیان بۆ هەولێر هەولی چاندنی تۆی دوو بەرەکیان لە نێوان خەلکی شارەکە داوە وهەولیان داوە بۆ بە هێز کردنی دەسەلاتیان سود لە کەمە نەتەوەیی وئاینیەکان وەربگرن[٣١] ، لە کاتی بۆنە تایبەتەکاندا جێگری حاکمی سیاسی بە جیا پێشوازی لە چینەکانی هەولێر کردووە بە تایبەتی( مەسیحی ویەهودی ) [٣٢].

لە رووی کارگێری دا دەستیان کرد بە رێکخستنەوەی کاروبارەکان وهەمان دام ودەزگاکانی عوسمانیان هێشتەوە ولە سەر هەمان سیستەمی بەرێوەبردن کە لە شارەکەدا هەبوو و هۆکارەکەشی دەگەرایەوە بۆ رێك ودورستی دەزگاکان وئەرکەکانیان وداوایان کرد کە فەرمانبەرەکان بگەرێنەوە سەر کارەکانیان وموچەیان بکرێتە دوو ئەوەندەی کە وەریان گرتووە[٣٣] هەروەها هەر بە مەبەستی رێکخستنەوەی کاروبارەکان ( احمد عیمان ) کە ئەرکی سەرۆکی شارەوانی بەرێوە دەبرد لە هەمان کاتدا کرا بە جێگری یاریدەدەری حاکمی

سیاسی هەولێر ومتمانەیان پێبەخشی بۆ پشگیری کردنی ئینگلیزەکان لە بەڕێوەبردنی کارەکانیان لە هەولێر [٣٤] .

کابتن (های) لە کاتی پشوی فەرمیشدا کە ڕۆژانی ( هەینی ویەکشەممە ) بوو ، پێشوازی لە ناودارەکانی شار دەکرد وگفتوگۆی لە سەر کارەکان لە گەڵدا دەکردن وبیروراکانیان دەخستە روو ، ئەمەش لە شێوەی ئەنجومەنێکدا بووە کە لەم کات کابتن(های ) ناوی ( پرلمان) ی لێنابوو ، دیارترین ئەم کەسانەی ئەنجومەنەکە ( مەلا فەندی ،سید عبدالله پاشا ، محمد ئەفندی موفتی هەولێر ،علی پاشا ،حاجی رەشید ئاغا ) بوون[٣٥] .

ئەم بارودۆخە تا رادەیەك جولانەوەیەکی هێناوە کایەوە وەك دەست کردنەوە بە کاروباری حکومەت وگەرانەوەی فەرمانبەران بۆ سەر کار وکردنەووەی ئەم قوتابخانانەی کە لە ئەنجامی شەردا داخرا بوون[٣٦].بەلام سەبارەت بە یاساکانی دەولەت لە سەر هەمان ئەم یاسایانە مانەوە کە لە سەردەمی عوسمانیەکان پەیرەو دەکران بە رەچاو کردنی شەرعیەتی ئیسلامی لە کێشە کارگێری ودادوەرییەکان[٣٧] ، بەلام کاروباری سیاسی شارەکە بە پێ ی بریارەکانی ( ولسن ) حاکمی سیاسی لە بەغدا بەرێوە دەچوو بەمجۆرە هەولێر لە قەزایەکی سەر بە لیوای کەرکوك بوو بە یەکەیەکی ئیداری سەربەخۆ سەر بە بەغدا، لە رووی سەربازیش دوای وەرگرتنی شارەکە لە لایان ئینگلیزەکان تیپێکی سەربازیان هێنا کە زۆربەیان هیندی سیخی بوون ، جگە لەم هێزەش بە مەبەستی بە هێز کردنی رەوشی ئاسایشی شارەکە گەورە پیاوانی ناوچەکانی (حەریر وشقلاوە ومەخمور) کرانە فەرمانبەر لە ناوچەکانی خۆیان بە پلەی ( قائیمقام وبەرێوەبەری ناحیە ) [٣٨] .

هەر چەندە پێش هاتنی ئینگلیزەکان بۆ هەولێر دوای هاتنیشیان هەولی ئەوەیان دەدا کە هەموو ناودار وئاغاکانی هەولێر بە لای خۆیان راکێشن بە مەبەستی دور خستنەوەی گیانی بەرگری ودژایەتی کردنی ئینگلیز لە شارەکە وەك لە بەلگەنامەکانی عوسمانیدا دەردەکەوێت (سید تەها نەهری) لە رێگای چوونی بۆ بەغدا لە سەر داوای حاکمی سیاسی ئینگلیز لە بەغدا ، سەردانی هەولێر دەکات و لە مالی مەلا فەندی (مەلای گچکە ) کۆبوونەوەیەك لە گەل ئاغاکان وناودارانی هەولێر دەکات وداوایان لێدەکات کە داواکارییەکانی ئینگلیز جێبەجێ بکەن لە شارەکەدا ، بەلام ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە زۆر بەتوندی دژی هەلوێستەکەی (سید تەها) دەوەستن[٣٩] .هەر بۆیە هەولەکانی ئینگلیز سەری نەگرت وەك ئەوەی کە دەیانویست ، چونکە هەندێك لە کەسایەتی وئاغاکانی هەولێر ئامادەی ئەوە نەبوون کە بێنە ژێر رکێفی فەرمانرەوایی ئینگلیز بەلکو هەر لە سەرەتای هاتنیان بە داگیر کەری شارەکەیان داناون وئامادە نەبوون هیچ جۆرە یارمەتی وموچەیەك لە ئینگلیز وەربگرن ، لە هەمان کاتیشدا بیرۆکەی دورست کردنی کۆمەلەی بەرگری کردن لە لایان گەلالە بیوو، دیارترینان( حاجی رەشید ئاغا ) کە کۆمەلەیەکی دژایەتی کردنی ئینگلیزی لە هەولێر دامەزراند، هەر چەندە وەك رێکخراوێکی سیاسی خاوەنی پەیرەو پرۆگرامی نەخشە بۆ کێشراو نەبووە[٤٠] بەلام ئامانج وئەرکی سەرەکیان دژایەتی ئینگلیز بووە و دان نەنانیان بە شەرعیەتی حوکمی ئینگلیز لە هەولێر ، سەبارەت بەو کەسانەش کە لەم بوارەدا هاوبیرورا بوون (عەتەولا ئاغای کوری رەشید اغا ) کە رۆژانە خەریکی بلاوکردنەوەی پروپاگەندە بوو دژی ئینگلیزەکان و( عەلی پاشا دوغرەمەچی و ئەحمەد پاشا دزەیی وپیرداود ئاغای

دزەیی ) [٤١] ، دەتوانین بلێین لە بەر ئەوەی ئەو کەسانەی لەم کۆمەڵەیە بوون لە ئاغاکانی هەولێر وناوچەکانی دزەیی بوونە ئەمەش ببووە هۆی ئەوەی کە خەڵکێك لە ناوەوەی هەولێر وناوچەکانی دەرەوەی هەولێر لە گەل ئەم ڕێکخراوەدا کار بکەن دژ بە ئینگلیز ، لە لایەکی تریش دەکرێت بووترێت خەڵکی هەولێر بە درێژایی مێژووی شارەکە دژی داگیر کردنی شارەکە بوونە .

هەر چەندە چالاکی روو بە ڕووبوونەوە لە نێوانیان رووی نەدا، بەڵام کۆبوونەوەی نهێنی لە نێوان ئەندامەکانی ئەم کۆمەڵەیە دەکرا دەربارەی بارودۆخی شارەکە ، یەکێك لە شوێنەکانی کۆبوونەوەکانیان مزگەوتی شێخی چۆلی بووە [٤٢] کە لەم کاتدا شوێنێکی چۆل بووە ، بە مەبەستی ڕێگا گرتن لە چالاکی وکۆبوونەوەکانی دژ بە داگیر کەری ئینگلیز ، ژمارەیەك لە مزگەوتەکانی هەولێر داخران کە ژمارەیان نزیکەی (١٠) مزگەوت دەبوو بە بیانووی ڕێگا گرتن لە بلاو بوونەوەی نەخۆشی [٤٣].

دوای گەرانەوەی کابتن ( های ) بۆ هەولێر و وەرگرتنی پۆستی یاریدەدەری حاکمی سیاسی بارودۆخی هەولێر بەمجۆرە نەبوو کە دەیانویست ، بلاوکردنەوەی نارەزایی وپروپاگەندە کردن دژ بە بوونی ئینگلیز لە هەولێر بەردەوام بوو [٤٤] ، بەلام سەبارەت بە دیارترین رووداو کە لە تەمموزی ١٩١٩ روویدا ، ئەم رووداوە بوو کە کاتێك ئینگلیزەکان بۆ بەسەربردنی کاتی شەو خەریکی یاری ورابواردن بوونە ، لە یەکێك لە شوێنە تایبەتەکان کە ئینگلیزەکان دورستیان کرد چونکە پێش داگیر کردنی ئینگلیز لە هەولێر ئەم جۆرە شوێنە تایبەتانە نەبووە ،(یونس سەعید ئاغا )وچەند کەسێك لە هاورێکانی ئامادەی ئەم شوێنە دەبن ، هەر بۆیە لە کاتی کە پەیوەندییان لە

گەل ئینگلیزەکان تێك دەچێت و ئینگلیزەکان هەولی ئەوە دەدەن کە دەست درێژی بکەنە سەریان بەلام ئەمان ئەمە قەبول ناکەن ولە ئەنجامی رووبەرووبونەوەیان یەکێك لە پیاوانی ئینگلیز بە ناوی (میپوین)* دەکوژرێت وعەریف (کینارد) بریندار دەبێت لە گەل ( یونس اغا ) [٤٥] .

کابتن (های) خۆی بە مەبەستی بە دواداچوون لەو رووداوە هەولی لێکۆلینەوە دەدات ، دوای پشکنینی ئەم مالانەی کە شوێنی گومانن لە لای ئینگلیزەکان (یونس ئاغا ) بە برینداری لە رۆژی ١٠ ی تەمموز دەست گیر دەکەن ، هەروەها ( ئەحمەد ئەفەندی ) روو لە ناوچە چیایەکان دەکات ودەستگیر ناکرێت . بەلام سەبارەت بە چارەنوسی (عبدالله افندی ) کە خەلکی کۆیە بوو بە هۆی دۆزینەوەی دەمانچەیەك لە مالەکەی لە کاتی پشکنیدا و تاوان باریان کرد کە بکوژی (میپوین) ە ، هەر بۆیە فەرمانی لەسێدارە دانی دەدرێت لە مانگی ئەیلول سزاکەی جێبەجێ دەکرێت ،کە لە راستیدا تەنها ئامادەی شوێنەکە بووە هیچ پەیوەندی بە کوشتنی(میپوین) نەبووە و(سعید اغا) حوکمی (٥) سال و ( یونس ئاغا ) ش حوکمی هەتا هەتایی بە سەردا درا [٤٦] ، کە دوای دامەزراندنی حکومەتی کاتی عێراق بە سەرۆکایەتی ( عبدالرحمن النقیب ) فەرمانی لێبوردنیان درا [٤٧] .

هەولێر لە سەردەمی ئینگلیزدا جۆرە پێشکەوتنێکی بەرچاوی بە خۆوە نەدیوە بەلام لە رووی کاگێری دا دوای ئەوەی ( مستر بل ) حاکمی سیاسی موسل پێشنیاری ئەوەی کرد کە هەولێر بکرێت بە (موتەسەرفیە) و هەردوو قەزای (کۆیە ورەواندوز) لە خۆ بگرێت ،کابتن (های) بە یاوەری سەرۆکی شارەوانی(ئەحمەد عوسمان) چوونە بەغدا بۆ ئەوەی ئەم پێشنیارە بخەنە

بەردەم (ولسن) ، کە لە سەرەتادا رەزامەندی لە سەر دەربڕی بەڵام دواتر بریار درا کە ببێتە موتەسەرفیە بەمجۆرە لە ١ی تشرینی دووەمی ١٩١٩ هەولێر بووە موتەسەرفیە [٤٨] و(ئەحمەد عوسمان) بوو بە یەکەم موتەسەرفی هەولێر [٤٩].

پەراوێز و سەرچاوەکان

(١) عێراق بە گشتی دابەشی سەر(٣) ویلایەت کرا بوو،ویلایەتی(موسل،بەغدا،بەسرا)،هەر یەك لەم ویلایەتانەش دابەش کرا بوو بۆسەرچەند سنجەقێك و هەر سنجقێك بۆ سەر چەند قەزا وهەر قەزایەك بۆ سەر چەندناحیەك وبەڕێوەبەری ناحیە بەڕێوەی بردووە ، هەر ناحیەکیش بۆسەر چەند گوند دابەش کرا بوو کە(موختار) لێپرسراوی گوندەکان بووە لە ڕووی کارگێری: ألبرت.م.منتشاشغیلی،العراق فی السنوات الانتداب البریطانی،ط(١)،مطبعة جامعة بغداد،بغداد،١٩٧٨،ص ٢١ـ٢٢ ، موصل ولایتی سالنامة رسمیسیدر ١٣٣٠ه /١٩١٢م ،ص٢٧٤.

(٢) بۆ زیاتر زانیاری بروانە : کمال مظهر احمد ، کردستان فی سنوات الحرب العالمیة الاولی ، ترجمة:محمد الملا عبدالکریم،ط( ٢) ، بغداد، ١٩٨٤،ص ٢٢٩ـ٢٣٠ .

(٣) سروە اسعد صابر ،کوردستان من بدایة الحرب العالمیة الاولی الی نهایة مشکلة الموصل ١٩١٤ ـ ١٩٢٦،ط(١)،اربیل،٢٠٠١،ص ٣٧ .

(٤) بەیاننامەی دەولەتی عوسمانی لە لایان سولتان محمد ڕەشادی پێنجەم .

(٥) سروە اسعد، المصدر السابق ، ص ٤٣. بۆ زیاتر زانیاری بروانە : المس بیل،فصول من تاریخ العراق القریب بین سنتی ١٩١٤ـ١٩٢٠ ،ترجمة:جعفر الخیاط،ط(٢)،بیروت،٢٠٠٤،ص ١٠ ـ ١٥ .

(٦) بۆ زیاتر زانیاری بروانە : ممدوح مزوری ،مێژووی رواندوز،چ(١)،هەولێر ،٢٠٠٦،ل ٢٧٦ـ ٢٧٩ .

(٧) اسماعیل بشیر چیچۆ، اربیل ایام ...زمان ، خەبات " رۆژنامە " ، عدد (٨٢٠) .

(٨) م.س.لازاریف ، کێشەی کورد ١٨٩٦ـ١٩١٧،چابخانەی حافظ، بەغداد،١٩٨٩،بەشی دووەم ، ل ٦٦١ .

* لە سالی ١٨٦٣ لە هەولێر لە دایك بووە ، لە سەردەمی حوکمرانی دەولەتی عوسمانی لە ماوەی نێوان سالانی (١٨٩٩ ـ ١٩٠٤) سەرۆك شارەوانی هەولێر بووە و لە سالی ١٩٣٩ مردووە .

(٩) چاوپێکەوتنێك لە گەل د. ارسن موسی رشید ، لە ٢٠٠٧/٥/٢٥،چاوپێکەوتنێك لە گەل حاجی طاهیر تەرجانی ، لە ٢٠٠٧/٤/١٨ .

(١٠) چاوپێکەوتنێك لە گەل عبدالله مستەفا غەزایی ، لە ٢٠٠٧/٥/٢٩

(١١) کمال مظهر احمد،المصدر السابق ،ص ٢٢٦ .

(١٢) چاوپێکەوتنێك لە گەل کنعان موفتی ، لە٢٠٠٧/٤/٨، چاوپێکەوتنێك لە گەل نورالدین دەباغ ، لە ٢٠٠٧/٥/٢٤ .

(١٣) محمدی مەلا کریم ،نیکتێن لە مەسەلەی کورد دەدوێ ،بەیان "گۆڤار"،ژ (٧)،١٩٧٢، ل٦.

(١٤) بۆ زیاتر زانیاری بروانە :عەبدوللا عەلیاوەیی،کوردستان لە سەردەمی دەولەتی عوسمانیدا (لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا جەنگی یەکەمی جیهانی ، چ (١) ،سلێمانی،٢٠٠٤،ل ١٩٥ ـ ٢٠٧ .

(١٥) بۆ نمونە کاتێك (شێخ عبدالسلام بارزانی) لە سالی ١٩١٤ جولانەوەیەکی سیاسی دژی عوسمانیەکان هەلگیرساند (مستەفا هەولێر) ی یـەکێك لەم سەرکردانە بووە کە بەشداری تێدا کـردووە بۆ زیاتر زانیاری بروانە : بی رەش ،بـارزان والحرکة الوعـی القومی الکوردی

(١٨٢٦ ـ ١٩١٤ ) ، ١٩٨٠ ، ص ١٢٨ .

(١٦) سروە اسعد، المصدر السابق ، ص ٦٤ .

(١٧) ستیفن هیمسلی لونکریك ،اربعة قرون من تاریخ العراق الحدیث ،ترجمة: جعفر الخیاط ،بیروت ،١٩٤٩،ص ١٦٢ .

(١٨) وەك شارۆچکەی خانەقین و کفری وروانذوز.بۆ زیاتر زانیاری بروانە : ممدوح مزوری ،سەرچاوەی پێشو، ل٢٧٧ .

(١٩) وەك لە بەندی حەوتەمی رێکەوتننامەی مۆدرۆسدا هاتووە کە لە هەر شوێنێك ئاسایشی هاوپەیمانەکان بکەوێتە مەترسی یەوە ، مافی ئەوەیان هەیە ئەو شوێنە داگیر بکەن .بروانە : فاضل حسین،کێشەی ویلایەتی موسل،و: محمد شاکەلی،سلێمانی،١٩٩٩،ل٧ـ٨، عزیزالحاج،القضیة الکردیة فی العشرینات،ط(٢)،مطبعة الانتصار،بغداد،١٩٨٥،ص٣١ .

(٢٠) هادی رشید الجاوشلی ، تراث اربیل التاریخی ،ط(١) ، مطبعة جامعة الموصل ،موصل، ١٩٨٥،ص ٢٣ .

(٢١) هادی رشید الجاوشلی، المصدر السابق،ص ٢٤ .

(٢٢) دبليو.ار.هى،سنتان فى كردستان١٩١٨ـ١٩٢٠،ت: فؤاد جميل، ط (١)، بغداد، ١٩٧٣ ، الجزء(١)،ص ١٤٤ .

(٢٣) بۆ زیاتر زانیاری بروانە : المصدر نفسه ، ص ١٤٧ ـ ١٤٨ .

(٢٤) سەرکردەی سوپای تورك لە بنەرەتدا خەلکی قەفقاز بووە و بە زمانێکی تورکی نارێك قسەی دەکرد . المصدر نفسه ، ص١٥١ .

(٢٥) قەزای هەولێر لە لایان ( قائمقام )ەوە بەرێوەدەبردراکە زۆربەی قائمقامەکانی قەزای هەولێر بە رەگەز تورك بووینە ، بەلام لە هەندێ کاتدا کوردیش ئەم پۆستەیان وەرگرتووە ولەلایان سولتانەوە هەلبژێردراون لەمانەش (عبدالله پاشای کوری عباس ئاغای ئەحمەدی ) کە لە سالی ١٨٩٠ کراوە بە قائمقامی هەولێر .بروانە : ألبرت.م.منتشاشغيلى،المصدر السابق ، ص٢١ـ ٢٢، شیرزاد شيخ محمد ، الاثار الدينية فى اربيل ( المقابروالمساجدوالجوامع والتكايا القديمة فى اربيل ) ، ط (١)،اربيل،٢٠٠٢،ص ١٨٥ .

(٢٦) دبليو.ار.هى، المصدر السابق، ج(١)،ص١٥٢ .

(٢٧) دبليو.ار.هى، المصدر السابق ، ج(١)،ص ١٩٧ .

(٢٨) اسماعيل شكر رسول،اربيل (دراسة تاريخية في دورها الفكرى والسياسى ١٩٣٩ـ١٩٥٨)،ط(٢)،سليمانية ،٢٠٠٦،ص٣٤ .

* پارەیەکی هیندیە تا دەرچوونی پارەی نیشتمانی عێراقی لە سالی ١٩٣٢ کاری پێکراوە . یەك روپیە دەکاتە ( ٧٥ ) فلسی ئەوکات .

(٢٩) مختارات من كتاب الموصل وكركوك فى الوثائق العثمانية،ت :خليل على مراد ،ط(١)،مطبعة شڤان ،السليمانية،٢٠٠٥،ص ١٧٤.

(٣٠) دبليو.ار.هى، المصدر السابق، ج(١)،ص ٢١١ ـ ٢١٢ .

(٣١) كمال مظهر احمد،المصدر السابق ،ص ٣٩ .

(٣٢) بۆ زیاتر زانیاری بروانە : دبليو.ار.هى، المصدر السابق، ج(١)،ص ٢١٤ ـ ٢١٥ .

(٣٣) هادى رشيد الجاوشلى ، المصدر السابق ، ص ٢٤ .

(٣٤) خليل على مراد ، المصدر السابق ، ص ١٧٤ .

(٣٥) دبليو.ار.هى، المصدر السابق، ج(١)،ص ٢١٢ .

(٣٦) لە کاتی گۆڕینی دەسەلاتی عوسمانی بە دەسەلاتی ئینگلیزەکان لە هەولێر قوتابخانەکان داخراون و دوای ئەوەی (کابتن فارل)گەرانێکی پشکنینانەی لە هەندێ ناوچەی کوردستانی باشوور کرد ، قوتابخانە سەرەتاییەکانی هەولێریش کرانەوە . بۆ زیاتر زانیاری بروانە :

محمد عبدالله کاکەسور ، گەشەکردنی خوێندنی فەرمی لە لیواکانی کوردستانی عێراق دا (١٩٢١ـ١٩٥٣ )،نامەی دکتورا ( بلاوکراوە ) کولێژی ئاداب ،زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر ،٢٠٠٣ ،ل ٢٤ .

(٣٧) هادى رشيد الجاوشلى، المصدر السابق،ص ٢٤ .

(٣٨) هادى رشيد الجاوشلى، المصدر السابق ،ص ٢٤، مولود بێخالی ، هەولێرم وادیوە وبیستوە ،هەولێر ، ١٩٩٨،بەرگی دووەم ،ل ٢٧ .

(٣٩) خليل على مراد ، المصدر السابق ،ص١٧٤

(٤٠) المصدر نفسه،ص ١٧٤، دبليو.ار.هى، المصدر السابق، ج(١) ،ص ١٩٩ـ٢٠٠ .

(٤١) دبليو.ار.هی، المصدر السابق، ج(١) ،ص ٢٠٠ ، چاوپێکەوتنێك لە گەڵ د . ئەرسن موسی رشيد ، لە ٢٥ /٢٠٠٧/٥ .

(٤٢) چاوپێکەوتنێك لە گەڵ د . ئەرسن موسی رشيد ، لە ٢٥ /٢٠٠٧/٥.

(٤٣) خليل علی مراد ، المصدر السابق ،ص١٧٤

(٤٤) دبليو.ار.هی، المصدر السابق، ج(١) ،ص ١٩٧ .

* لە دێ ی ( عەنکاوە ) لە سەر گردێك دەنێژرێت تا ئێستاش گۆڕەکەی ماوە .

(٤٥) بۆ زياتر زياتر زانياری بروانە : دبليو.ار.هی، المصدر السابق، ج(١) ،ص ٢٠١ .

(٤٦) دبليو.ار.هی، المصدر السابق، ج(١) ،ص ٢٠٢ ، چاوپێکەوتنێك لە گەڵ حاكم ناظم يونس ، لە ٢٠٠٧/٣/٢٦ .

(٤٧) دەربارەی پێکهاتەی یەکەم حکومەتی عێراقی کاتی بروانە : عبدالرزاق الحسنی ، تاريخ العراق السياسی الحديث ، ط (٦)،مطبعة دار الكتب،بيروت،١٩٨٣،ج(١)،ص ١٩٢ـ١٩٣ .

(٤٨) بۆ زياتر زانياری بروانە :دبليو.ار.هی، المصدر السابق، ج(١) ،ص ٢١٩ـ٢٢٣ .

(٤٩) تا ١ی نيسانی ١٩٢٧ بە موتەسەرفی هەولێر دەمێنێتەوە .بۆ زياتر زانياری دەربارەی مێژووی موتەسەرفەکانی هەولێر بروانە : اربيل ( هەولێر) بين الماضی والحاضر ، من منشورات المهرجان السنوی الثالث لمدينة اربيل ، اربيل،١٩٨٧،ص ٢٣ـ٣١ .

## سەرچاوەکان

### یەکەم / بەلگەنامەکان .

**١- بلاونەکراوەکان .**

- بەیاننامەی سولتان محمد رەشادی پێنجەم بۆ دانیشتوانی دەولەتی عوسمانی .

**٢- بلاوکراوەکان .**

**ا / بە زمانی عەرەبی .**

- موصل ولایتی سالنامە رسمیسیدر ،١٣٣٠ھ /١٩١٢م .
- مختارات من كتاب الموصل وكركوك في الوثائق العثمانية ، ترجمة وتعليق :خليل علي مراد، ط(١) ، مطبعة شڤان ، السليمانية ،٢٠٠٥ .

### دووەم / چاوپێکەوتنەکان .

- چاوپێکەوتنێك لە گەل د .ئەرسن موسی رشید ، لە ٢٥ /٥ /٢٠٠٧ .
- چاوپێکەوتنێك لە گەل حاجی طاهیر تەرجانی ، لە ٢٠٠٧/٤/١٨ .
- چاوپێکەوتنێك لە گەل عبدالله مستەفا غەزایی ، لە ٢٠٠٧/٥/٢٩
- چاوپێکەوتنێك لە گەل کەنعان موفتی ، لە ٢٠٠٧/٤/٨ .
- چاوپێکەوتنێك لە گەل ناظم یونس ،لە ٢٠٠٧/٣/٢٦ .
- چاوپێکەوتنێك لە گەل نورەدین دەباغ ،لە ٢٠٠٧/٥/٢٤ .

### سێیەم / نامەکانی زانکۆیی .

- بە زمانی کوردی .
- محمد عبدالله کاکەسور،گەشەکردنی خوێندنی فەرمی لە لیواکانی کوردستانی عێراق دا (١٩٢١-١٩٥٣ )،نامەی دکتورا ( بلاوکراوە ) ،کولێژی ئاداب ،زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر ،٢٠٠٣ .

چوارەم/ سەرچاوە عەرەبیەکان .

- اسماعیل شکر رسول،اربیل (دراسة تاریخیة في دورها الفکری والسیاسی ١٩٣٩-١٩٥٨)،ط(٢)،سلیمانیة ،٢٠٠٦.
- ألبرت .م.منتشاشغیلی،العراق في السنوات الانتداب البریطانی،ط(١)،مطبعة جامعة بغداد،بغداد،١٩٧٨.
- المس بیل،فصول من تاریخ العراق القریب بین سنتی ١٩١٤-١٩٢٠،ترجمة:جعفر الخیاط،ط(٢)،بیروت،٢٠٠٤.
- بی رەش ،بارزان والحرکة الوعی القومی الکوردی(١٨٢٦ - ١٩١٤ )، ١٩٨٠ ، ص ١٢٨ .
- دبلیو.ار.هی ،سنتان في کردستان،ترجمة فؤاد جمیل،ط(١)،بغداد،١٩٧٣،الجزء (١) .
- ستیفن هیمسلی لونکریك ،اربعة قرون من تاریخ العراق الحدیث ،ترجمة: جعفر الخیاط ،بیروت ،١٩٤٩.
- سروة اسعد صابر ،کوردستان من بدایة الحرب العالمیة الاولی الی نهایة مشکلة الموصل ١٩١٤ - ١٩٢٦، ط (١)،اربیل،٢٠٠١.

ـــــ شـــيرزاد شـــيخ محمـــد،الاثار الدينيـــة فـــى اربيـــل (المقابروالمـــساجدوالجوامع والتكايـــا القديمـــة فـــى اربيـــل) ط(١)،اربيل،٢٠٠٢.

ـ عبدالرزاق الحسنى ، تاريخ العراق السياسى الحديث ، ط (٦)،مطبعة دار الكتب،بيروت،١٩٨٣،الجزء (١) .

ـ عزيز الحاج،القضية الكردية فى العشرينات،ط(٢)،مطبعة الانتصار،بغداد،١٩٨٥.

ـ كمال مظهر احمد ، كردستان فى سنوات الحرب العالمية الاولى ، ترجمة:محمد الملا عبدالكريم ،ط(٢)،بغداد،١٩٨٤.

ـ مؤلف مجهول ، اربيل (هەولێر) بين الماضى والحاضر ،من منشورات المهرجان السنوى الثالث لمدينة اربيل ، اربيل،١٩٨٧.

ـ هادى رشيد الجاوشلى ، تراث اربيل التاريخى ،ط(١) ، مطبعة جامعة الموصل ،موصل، ١٩٨٥ .

پێنجەم / سەرچاوە کوردییەکان .

ـ سيد مولود بێخالى ، هەولێرم واديوە وبيستوە،چ(١)،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر،٢٠٠٥، بەرگی سێیەم .

ـ عەبدوللا عەلیاوەیی،کوردستان لە سەردەمی دەولەتی عوسمانیدا(لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا جەنگی

یەکەمی جیهانی ،چ (١)، سلێمانی،٢٠٠٤ .

ـ فاضل حسین،کێشەی ویلایەتی موسل،و: محمد شاکەلی،سلێمانی،١٩٩٩ .

ـ م.س.لازاریف ، کێشەی کورد ١٨٩٦ـ١٩١٧،چابخانەی حافظ، بەغداد،١٩٨٩،بەشی دووەم .

ـ ممدوح مزوری ،مێژووی رواندوز،چ(١)،هەولێر ،٢٠٠٦ .

حەوتەم / گۆڤار ورۆژنامەکان .

ـ اسماعیل بشیر چیچۆ، اربیل ایام ...زمان خەبات "رۆژنامە "،عدد (٨٢٠) .

ـ محمدی مەلا کریم ،نیکتین لە مەسەلەیَ کورد دەدویَ ،بەیان "گۆڤار"،ژ (٧)،١٩٧٢.

# ڕۆڵی شارستانیەتی ئیسلامی لە ڕێنیسانسی ئەوروپادا

ن : علی البیکدلی

و : بورهان حاتەم گۆمەتاڵی

ڕۆژهەلاتناسی ناودار ( فلیپ ولف ) مامۆستای زانکۆی تولوز لە کتێبەکەی(( ڕێنیسانسی فیکری لە ئەوروپادا )) دەڵێت (( ڕێنیسانسی کارۆلنجین لە سەدەی نۆیەم کە بووە مایەی بزواندنی خۆرئاواو هەڵسان بە بنیاتنانی شارستانیەتەکەی ، بەرپانەدەبوو گەر بە سوود وەرگرتن نەبووایە لە گەنجینە زانستی و مەعریفی یەکانی وولاتانی خۆرهەلاتی ناوەڕاست . ئەمەو ولْف زیاتر دەڵێت : پێویستە وولاتانی نێوان دوو ڕووبارەکە لەیاد نەکەین کە لە گەورەترین ئەو ناوەندانەنەیە یارمەتی دروست بوونی ژیانی ئەوروپایی داوە)).

لە گەڵ ئەوەشدا تیۆرەکەی فلیپ ولف لە لایەن هەموو زانایانی ئەوروپاوە پەسند نەکرا ، بەلام گومانی زۆرینەیان بەلای ئەوەدا دەچێت کە سەرەتا زانست لە خۆرهەلاتەوە سەری هەڵداوە . وە ئەوانەی لە گەڵ ڕاکەی فلیپ جیان سوورن لە سەر توێژینەوەیەکی سەرەتایی لە بارەی ئەوەی : ئەگەر ئەوەی لە ڕۆژهەلات دەرکەوتووە وەکو زانستێکی دابنێین ، ئاخۆ ئەمە لە بنچینەدا زانستە یاخود ئەزمونێکی تاکەکەسی ؟ لە وەلامی ئەمەدا دەڵێین ، هەرچەندە لە سەرەتادا زانستەکانی ڕۆژهەلات بۆ پێویست گەلێکی خەڵکی

و ئەزمونگەلێکی تاکەکەسی پەیدابوون ، بەڵام لە گەڵ ئەوەش — لە کۆتایدا — بۆ چەند بۆچونێکی زانستی گۆڕان .

کاتێ مرۆڤ لە خواکانی سەر زەوی تێربوو ، ئەمجارەیان کەوتە سەرنج دانی ئاسمان ، سەبارەت بەوەی ئاسمان سەرچاوەی خێربوو ، بەهۆی بارینی باران و بوونی خۆر تیایدا وەلەهەمان کاتدا پەناگەیەکی بە هێزو نادیارو شوێنی نیشتەجێ بوونی خواوەندەکان بوو . لە سەر ئەم بنچینەیە ، بابلی یەکان بۆ یەکەم جار ئەوەیان ڕاگەیاند کە شوێنەواری ئەستێرە — بەهێزەکان — لە دیاریکردنی دواڕۆژی مرۆڤ کاریگەریان هەیە ، بەڵام کلدانی یەکان ، پێش بابلی یەکان کەوتبوون لە دیاریکردنی شوێن و ناوو جولەی ئەستێرەکان وڕێڕەوی جوڵانیان کە لە ڕوواڵتدا ڕێك و پێك نەبوون ، وەهەڵسان بە پێوانی ماوەی نێوان ئەستێرەکان و شوێنەکانیان ، وە ئەو خولگەیان دیاریکرد کە خۆر لە ماوەی خولی ئاشکرای خۆی بە دەوری زەوی دا لە ماوەی ساڵێك دا تەواوی دەکات . وەهەروەها هەڵسان بە پێوانی ناوچەی کەلووەکان .ساڵیشیان بۆ ٣٦٥ ڕۆژ دابەش کرد لە چوارچێوەی ١٢ مانگ دا . بەمە توانی یان ساڵی خۆری ( السنة الشمسية) دیاری بکەن . لە وڵاتی میسریشدا ، سەرەڕای گرنگی دانی میسریەکان بە ژمێرەو ئەندازە ، لایەنی پزیشکی و توێکاریشیان گەشە پێدا تاکو لە کرداری مۆمیاکردن سوودی لێ ببینن. ئەمە بەشێکی کەم بوو لە تووێشووی زانستی خۆرهەڵات ، بە هۆی ئەمەوە ڕێ بە خۆمان ئەدەین کە بڵێین : خۆرهەڵات سەرچاوەو بنەڕەتی زانستەکان بووە .

ئەم بانگەیەش زۆرێك لە زانایانی خۆرئاوا پشتگیری لێ دەكون ، بەلاّم ، چۆن ئەو زانستانە بۆ ئەوڕپا گواسترانەوە ؟ هەڵبەتە یۆنانی یەكان یەكەم نەتەوە بوون كە لە جوگرافیای ئەوڕپا جیابوونەوە و چەند داگیرگەیەكیان لە سەر كەناری نیل لە ئاسیای بچووك چنگ كەوت . ئەمە سەرەڕای ڕۆڵی بازرگانەكان ن بەم شێوەیە زەمینە سازیەك بۆ گواستنەوەی ئەو زانستانە بۆ ڕۆژئاوا لە باربوو ، دوا بەدوای ئەو ململانێ سەربازی و سیاسی یانەی كە لە وێدا ڕوویان دا ، خێرایی پرۆسەی گواستنەوەی ئەو زانستانە زیادی كرد . زانایانی یۆنانی كە بە دامەزرێنەری باس و توێژینەوە زانستی یەكان دائەنرێن فاكتەرەكانی ڕووخساوە سرووشتی یەكانیان لە چوارچێوەی توانای خواوەندە سیحراوی و نادیارەكان دا بردە دەرەوە — تالّیس كە بە دامەزرێنەری فیكری زانستی ئەوڕوپادادەندرێن ڕایگەیاند ، كە دەركەوتنی دیاردە سروشتی یەكان كارێكە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو گەشەسەندن و گۆڕانكاریانەی كە لە ناوخودی سروشت خۆی ڕوونەدات ، وە هیچ پەیوەندیەكی بە ویستی خوداوەندەكانەو نیە ، بەم هۆیە بیركردنەوەی مرۆڤ لە ئاسمانێكی خەیالاّوی یەوە بۆ بیركردنەوە لە زەوی دابەزی ، بۆ نمونە ئەم پرسیارە دەهاتە پێشەوە كە هۆی چی یە باران دەبارێت؟ وەلاّمەكەشی ئەوە بوو كە لەبەر ئەوەی كەش و هەوا لە گەرمیەوە بۆ كەشێكی سارد دەگۆڕێت. وە یاخود بۆچی گەلاّكانی دار و درەخت دوای ئەوەی كە سەوزن، زەرد ئەبن؟ وەلاّمەكەشی ئەوە بوو كە: بەهۆی ئەوگۆڕانكاریانەوەیە كە لەناو خودی مادەدا ڕوو ئەدا، تا لیس ئاوی بە مادەیە دائەنا(٨).

لە راستیدا تالیس قوتابخانەی (مەڵەتیە) ی دامەزراند کە زێتر گرنگی بە بۆچونی مادی دەدا. وە قوتابیەکانیشی وەکو ئینکسیمندەر و ئەوانی تریش هەمان رێچکەی ئەویان گرتە بەر. لەم نێوەندەشدا کەسانی وا هەبوون کە دژی ئەو قوتابخانەیە بوەستن لە نموونەی ئەوانەش فیساگۆرس کە قوتابخانە میسالیەکەی خۆی دامەزراند، ئەو پێی وا بوو کە ژمارەکان هێزێکی مەزن و نادیاریان هەیە و کاریگەری لە رووداوەکان ئەکەن(٩).

ئەمە لەکاتێکدا هرقلیدس دامەزرێنەری تۆری جوڵەو، دیموقریتس دانەری تیۆری ئەتۆمیگۆڕانکاریەکی مەزنیان لە جیهانی هزر و فەلسەفە بەدی کرد.سۆفستائیەکانیش زانستی سۆسیۆلۆژی و سیاسەتیان دامەزراند. وە سوقراتیش ڕەوشت (الاخلاق)ی بە بنچینەی هزرە فەلسەفیەکەی خۆی دانا. وە هەوڵی دا بۆ جەنگان لە دژی باو و نەریتەکانی کۆمەڵگەکەی، بۆیە سیستەمێکی نوێی دامەزراند، ئەم مەزەبە فیکریەش گەورەترین جیاوازی بوو لە نێوان مامۆستاو قوتابیەکەی، واتە لە نێوان سوقرات و ئەفلاتون. چونکە ئەفلاتون خاوەن ڕەگێکی ئۆرستکراتی بوو پێی وابوو کە پاراستنی باو و نەریتە ئۆرستکراتیە کۆنەکان پێویستەو نابێ دەست بەرداری بن، بە هۆی ئەمەشەوە لەگەڵ مامۆستاکەی ناکۆك بوو، وە هەروەها کۆمەڵگەی ئیسپارتیە ئۆرستکراتیەکانی کردە نموونەیەك بۆ شارە چاکەکەی. ئەفلاتۆن لە میانەی تیۆرە میسالیەکەی دەروازەیەکی نوێ ی کردەوە بە رووی فیکری فەلسەفی دا، لە کاتێکدا ئەرەستۆ تاقانە بوو لە فیکردا، کە توانی بە هۆی بۆچوونەکانیەوە بەسەر گشت زانستەکانی ئەو سەردەمەدا زاڵ بێت و زۆر لە زانستە نوێ یەکانی بەتایبەت زانستی لۆژیکی(١١) دامەزران.

دەرکەوتنی ئەرستۆ هەماهەنگ بوو لەگەڵ داگیرکاریەکانی ئەسکەندەر و لە ناوچوونی بیروڕای شار– کە بە پێی ئەم بیروڕایە دەوڵەت وەکو بنکەیەکە بۆ بۆچوونی سیاسی و یەکێکە لە فاکتەرەکانی گەشەسەندنی هزر– وە هەروەها بۆچوونە سەربازیەکانی ئەسکەندەر بوونە هۆی خەفە کردنی بیروراو، بەمەش قۆناغی یەکەم لە دروست کردنی شارستانیەتی خۆرئاوا کۆتایی پێ هات.

لەو کاتەوەی کە لەشکرەکانی ئەسکەندەر بەرەو ئاراستەی خۆرهەلآت کەوتنە جووڵە، قۆناغی یەکەم لە ململانێ ی نێوان خۆرئاواو خۆرهەلآت دەستی پێکرد، لەگەڵ هاتنی ئەو لەشکرانە بۆ خۆرهەلآت کلتورێکی زانستی و فەلسەفی یۆنانیان لەگەڵ خۆیاندا هێنا، بۆیە کۆمەلگاکانی ئێمەش بەشێوەیەکی توند بە ژیان و رۆشنبیری یۆنانیەکان کاریگەر بوون. ئەسکەندەر لە عەقلیەتە لاویەکەیدا وێنەی ئیمپراتۆرێکی جیهانی هەڵگرتبوو. هەر بۆیە دژایەتی بیروبۆچوونی رەگەزی و نەتەوایەتی یۆنانیەکانی دەکرد. وە باش دەرکی بەوە کردبوو کە یەکخستنی گەلانی بەزیو لە لایەنی کلتورەوە زەرورەتێکە بۆ دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتە جیهانیەکەی(١٢)، بۆیە هەڵسا بە لاسایی کردنەوەی پاشاکانی ئێران و فیرعەونەکانی میسر لە بانگەشە کردن بۆ خوایەتی، وە جلی دجادووگەری پۆشی و، هێزێکی لە ئەسیناوە بۆ ئەسکەندەریە گواستەوە هەر لەم شارە نوێ یەدا زانایانی یۆنانی هەڵسان بە دابەشکردنی جۆرەکانی زانست هەر یەك لە: بەتلیمۆس و ئەرخەمیدس و جالینۆس لە زانستێکی تایبەت بە خۆیاندا توێژینەوەیان ئەنجام دەدا. بەم شێوەیە جارێکی تر خۆرهەلآت وەکو مەڵبەندێکی گەشە سەندنی زانستی

لێهات. ئەسکەندەریە کە بە گەورەترین و ناودارترین مەڵبەندی زانستی لەو چەرخە بەڵکو تا دەرکەوتنی ئیسلامیش دائەنرا، توانی شوێنە هەستیار و گرنگەکەی خۆی بپارێزێت. ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی کە لە دەریای ناوەراستەوە تا وەکە هیند وە لە دەریای خەزەرەوە تاوەکو باکوری ئەفریقیا درێژ ئەبووەوە، توانی بەسەر چەندین شوێن وەکو قوتابخانەو دێرەکاندا زاڵ بێت کە پێشتر کۆمەڵە مەڵبەندێك بوون بۆ کلتورو رۆشنبیری یۆنانی و رۆمانیەکان(١٣).

لەسەر گووتەی زۆرێك لە زانایانی خۆرئاوا، ئیسلام فاکتەرێکی کاریگەر بوو بۆ پاراستنی زانستە یۆنانیەکان، چونکە هاندانی خەڵك بۆ زانست و زانیاری، لە تایبەتمەندیەکانی ئیسلامە، وە هەروەها یەکێکە لەو فرمانانەی کە پێغەمبەری خوا (د.خ) جەختی لەسەر کردۆتەوە، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە زانیانی ئاینیی لە پێناو پاراستن و بلاّو کردنەوەی زانست هەوڵ و کۆششی زۆر بدەن.

لەسەردەمی عەباسیەکاندا، بەتایبەتیش لە سەردەمی (المنصور الدوانیقی) و (هارون الرشید) و (مأمون) ی کوڕی دەست کرا بەکۆکردنەوەی بەڵگەنامەو کتێبە زانستیەکان لە شاری بەغدا و، بزووتنەوەی وەرگێڕان هاتە دروست کردن(١٤). وە هەر لەم سەردەمەدا قوتابخانەکانی ئیمام باقر و ئیمام صادق ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی دەستە جیاوازەکانی موسڵمانان و نا موسڵمانەکانی لە خۆ گرتبوو بە مەبەستی خوێندن و توێژینەوە، ئەمەش بووە مایەی گەشە سەندن و پێشڤەچوونی زانست. وەهەر لەو ماوەیەشدا هەموو بەڵگە نامە زانستیەکان لە گشت لایەکی جیهانەوە بۆ ساز و

ئامادەکردن و وەرگێڕانیان رەوانەی بەغدا ئەکران، ئەوە بوو رێنیسانسێك لە بواری فەلسەفە و زانستدا هاتە ئاراوەو، سەردەمی زێرینی شارستانیەتی ئیسلامی دەستی پێکرد(١٥).

بەڵام بەداخەوە، لە هەردوو سەدەی سێیەم و چوارەمی کۆچی دا بە هۆی دەرکەوتنی رەگەزی تورك لەسەر شانۆی سیاسی و سەرهەڵدانی چەند مەڵبەندێکی بەهێز و نوێ، وەکو فاتمیەکان لە میصر و، ئەمەویەکان لە ئەندەلوس و، ئیسماعیلیەکان لە میصر و ئێران، ئەمەو سەرەڕای هێزە ناوخۆییەکان لەئەنجامدا بەغدا شوێن پایەی خۆی وەکو مەڵبەندێکی ئایینی- سیاسی لەدەست دا، ئەو بارودۆخە تەنگژاوییانە بەبێ هیچ گەشەسەندنێکی بۆچونی زانستی بە خۆرهەلاتی ئیسلامی گوزەریان کرد(١٦).

وە هەروەها لەسەدەی پێنجەمی کۆچی دا جەنگەکانی خاچ پەرستی لە نێوان خۆرهەلاتی ئیسلامی و خۆرئاوای مەسیحی دەستی پێکرد و بۆ ماوەی دوو سەدە بەردەوام بوو. هەموو ئەو زانیاریانەی کە بازرگانەکانی ڤێنیسیا لە میانەی کاری بازرگانی دا دەربارەی خۆرهەڵات چنگیان کەوتبوو، وە وێنەیەکی روون و ئاشکرای تەوژمە دژ بە یەکەکان و ئەو دابەش بوونەی کە گۆڕەپانی ئیسلامی بەدەستیەوە ئەینالاند، بەخشیە سەرکردەکان. هەرچەندە کە جەنگەکانی خاچ پەرستی بە سەرکەوتنی موسڵمانان لە لایەنی سەرازی یەوە کۆتایی پێ هات، بەڵام مەسیحیەکان توانیان لە ڕووی زانستیەوە سەرکەوتن بەدەست بهێنن ئەویش لەمیانەی ئەو توێشوە

زانستیەی کە لە ماوەی جەنگاکانیان لەگەڵ موسڵمانان جنگیان کەوت، بەم هۆیە توانیان ڕاپەرینێکی فەلسەفی و زانستی بەرپا بکەن(١٧).

## ڕێنیسانسی ئەورووپا

ڕێنسانسی ئەورووپا چەندین هۆکار و فاکتەری ناوخۆیی و دەرەکی هەبوون لە،وانە ئەوەی پەیوەندی بە جیهانی ئیسلامیەوە هەیە، دوو ڕووداوی گرنگی لێ هەڵدەبژێرین کە ئەوانیش: یەکەمیان: ئەو هێرشە سەر نەکەوتووەی کە تارق ی کوری زیاد لە ساڵی ٧١١ی ز. دا کردیە سەر ئەورووپا، بووە هۆی ئەوەی کە ئەورووپییەکان لە بێ ئاگایی سەدەکانی ناوەڕاست بێداربنەوە، وە ئەو هێرشە وای لە مەسیحیەکان کرد کە هۆشیار ببنەوە و چاوێك بە سیستەمی فەرمانرەوایەتیان دا بخشێننەوە، چونکە لەو کاتەدا ئوممەتی مەسیحی لە چوارچێوەی ڕژێمێکی سیاسی، ئایینی یەکگرتوو دا کە پاپا زاڵ بوو بەسەری دا، ژیانیان دەگوزەراند. بۆیە پاپا بە مەبەستی وەستان لە ڕووی هێزی لاوە موسڵمانەکان ناچار بەوە بوو کە لە ساڵی ٨٠٠ ز دا بەدەستی خۆی تاجی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز لە سەر سەری شارلەمان دابنێت(١٨)، لێرەوە دەسەڵاتەکانی پاپا دابەش بوون کە دەسەڵاتی ئایینی کەوتە دەستی پاپا و، دەسەڵاتی سیاسیش کەوتە دەستی ئیمپراتۆر.

شارلەمان بۆ بەهێز کردنی ژێرخانی ئیمپراتۆریەتەکەی هەڵسا بە ئەنجامدانی ڕێبیسانسێك، کە ئەوەش لە بنیادنانی ڕێنیسانسی ئەورووپا کاریگەری هەبوو. وە لەساڵی ٧٨١ز. دا شارلەمان داوای لە زانای ئینگلیزی

(کوین) (١٩) کرد کە شێوە و شکڵێکی نویٚ بۆ ئیمپاتۆریەتەکەی دابنێت، تا وەکو بۆ نویٚ کردنەوەی ژیانێکی عەقلانی زەمینە لە بار بێت.

بەر لە بنیادنانی شارستانیەتی خۆرئاوا شتێك روویدا کە بە ململانێی نێوان عەقڵ ئیمان ناوبرا. بۆ نموونە قەشە ئەنسێلم(٢٠) نوێنەرایەتی ئیمان و کلێسای دەکرد. لە کاتێکدا کە گێریبەرد (٢١) و جۆن سکۆت (٢٢) نوینەرایەتی عەقلانیەتی نوێیان دەکرد. لە ئاکامی ئەو روبەروو بوونەوانە دا پەرتەوازەییەك سەری هەڵدا کە رژێمی کلێساشی گرتەوە، چونکە بە هۆی دامەزراندنی قوتابخانەی چارتر لە فەرەنسا، مەڵبەندێکی نوێی زانستە نادینی یەکان لە بەرامبەر کلێسا دەرکەوت، کە مەڵبەندەکە ئامانجی زانست و فەلسەفەی گۆری لە کاتێکدا کە ڕێنماییەکانی مەسیحیەت ناوەڕۆکی ئەو دووانەی پێك دێنا. بە هۆی ئەو ڕێنیسانسەی کە کاڕۆلنجین هێنایە کایەوە مرۆڤ بووە تەوری زانست و (٢٣)، بەمەش فەلسەفەی مرۆڤ یاخود ئەوەی ناسراوە (هیۆمانیزم) پەیدا بوو، کە مرۆڤی کردەوە لە جیاتی تەوەرە بوونی خوا(٢٤).

قوستەنتینی ئیفریقی هەڵسا بە کۆکردنەوەی گشت توێژینەوکانی قوتابخانەی چارتر ئەمەش لەمیانەی وەرگێڕانی کتێب و دانراوەکانی جارینۆس و بەتلیمۆس و دیموقراتیس و سوکرت لە زمانی عەرەبی و عیبری یەوە بۆ لاتینی. کە ئەمەش لە سەدەی یازدەهەمی زایینی دا روویدا. بەم شێوەیە لە ماوەی هەردوو سەدەی یازدەهەم و دوازدەهەم دا ڕێنیسانسێکی وەرگێڕان لە خۆرئاوادا سەری هەڵدا، وەکو لاسایی کردنەوەیەکی خۆرهەلاتی ئیسلامی، چونکە لە خۆرهەلاتی ئیسلامیدا دواتر فەلسەفەو دانراوەکانی

زانایانی یۆنانی لە عەرەبیەوە بۆ گشت زمانەکانی تری ئەوروپی وەردەگێردرا.

## سەردەمی رۆشنگەری لە ئەوروپا

ڕێنسانسی رۆشنگەری ئەوروپا سەرتا دەستی پێکرد بە کۆکردنەوەی گشت بەڵگەنامە و سەرچاوەکان لە مەڵبەندە زانستیە جیاجیاکان، بە تایبەتیش لە مەڵبەندە ئیسلامیەکانی خۆرهەلات و ئەندەلوس(٢٥) و سویل و تۆلدو(٢٦) و سیراقمۆس (٢٧) و صەقلیە لەسەدەی پێنجەم دا بە شێوەی میرنشینی ئیسلامی بەرێوە ئەبران. ئەو بەڵگەنامە و سەرچاوانەش بە زۆری لەلایەن زانایانی کلێساوە بۆ زمانی لاتینی تەرجەمە دەکران(٢٨). وە پێویستە ئاماژەش بەوە بکەین کە ئەو بزاڤەی لە سەدەی نۆیەمەوە بە رێنسانسی کارۆلنجین دەستی پێکرد بۆ گۆرینی ژێرخانی کۆمەڵگا و بیر و بۆچوونەکان تاوەکو ئیمرۆش لە کار نەوەستاوە.هەروەکو سەردەمی بوژانەوەی ئەوروپا هاوکات بوو لە گەڵ گەشەسەندنی لایەنی ئابوری ، کە ئەویش دەرکەوتنی چینی ناوەڕاست ( بورژوازیەت ) بوو . ئەو بورژوازیەتیەی کە جلەوی کاروبارەکانی وەرگرت و . کۆمەڵگای خۆرئاوایی بە ئاراستەی بنیاتنانی شارستانیەتیەکی نویێ جولآند .

یەکێك لە دیمەنەکانی ئەو ڕێنیسانسە ، بریتی بوو لە وەدەرکەوتنی چەندین شار لە سەدەی یازدەهەم ، بەتایبەتیش لە ئیتالیا ، وەدەرکەوتنی ئەو شارانە وەکو بنکە گەلێك وابوون بۆ هێزی سیاسی و ئابوری بۆرژوازیەکان کە ئەمەش هاوکات بوو لە گەڵ سەرەتای سەردەمی بوژانەوە ، ئەو کات شار

شوێنی نیشتەجێ بوون و کارو چالاکی ئەو بازرگان و پیشەسازانە بوو کە ئاڵ و گۆڕی بەرهەم و کەلوپەلەکانیان بە بەرهەم و کەل و پەلی تر دەکرد ، بێگومان دواتر ئەو جۆرە مامەڵەیە گۆڕاو پارە جێگای گرتەوە . لە ڕاستی دا بزاڤی ڕۆشنگەری ، بزاڤێکی مرۆیی لە دژی دەسەڵاتی ئاینی بوو لە کۆمەڵگای ئەوروپادا وە پێشەکیەکیش بوو بۆ سەرەتای پەیدابوونی فیکرەی دەسەڵاتی عەلمانی( ٢٩) . بەڵام لە هەمان کاتیش دا ئەو بزاڤە بەشێکی زۆری لە سەر دەستی هەندێك لە پیاوانی کڵێسا پەیدابوو . چونکە بەشێك لە قەشەو پیاوانی ئایینی – لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا – لە گوزەرانی نێو پەرستگاکان بێزاربوون و ، ڕوویان لە شارەکان کرد کە وەکو مامۆستای زانکۆ و نوسەرو توێژەرو وەرگێڕ لەوێدا کاریان دەکرد .

کوپین هەوەڵ قەشەبوو کە پلەو پایەکی کارگێڕی بەرزی وەرگرت ، ئەویش بە وەرگرتنی وەزارەتی ڕۆشنبیری لە ئیمپڕاتۆریەتی شارلەمان. وە هەروەها لە سەدەی نۆیەمیشدا ، لودوفریبز( ٣٠ ) یەکەم قەشەبوو کە لەبارەی دانراوەکانی ( شیشرۆن ) (٣١ ) ەوە توێژینەوەی ئەنجام دا ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە کڵێسا نەیاری ئەو کارەبوو .

لەو کاتەی کە چینی ناوەند ( بورژوازیەت ) لە شارەکان دا نیشتەجێ بوون ، هەڵسان بە ڕێکخستنی دامەزراوە ئابوری و دواتریش کارگێڕی و ئینجا سیاسی ، و لە کۆتایشدا ڕۆشنبیری . ئەو کارەی دواییان بریتی بوو لە بزاڤی ڕۆشنگەری . ئەو بزاڤەی کە گشت داب و نەریت و ئاکارە بۆماوەیی و باوەڕو ڕەوشتێکی لاوازکرد ، وە مرۆڤی وەکو بوونەوەرێکی ئابوری سەربەخۆ دانا نەك وەکو کەسایەتیەکی سەر بە پێڕۆکانی کڵێسا . ئەو بزاڤەش بە

ڕێنیسانسی شارناس ( ٣٢ ) (٣٣) لە کارە سەرەتاکانی ڕێنیسانسی کارۆلنجین کە دوای سەدەی دوازدەهەم بووە مایەی بایەخ دانێکی زۆر پێ ی ، بریتی بوو لە دەرکەوتنی پرۆسەی ریفۆرمی ئایینی لە ساڵی ٨١٧ز ، لە سەردەمی ئیمپراتۆرلویس لولبو ( ٣٤) کە یەکێك لە کوڕەکانی شارلەمان بوو ، ئەوەش لە سەر دەستی قەشەیەك بە ناوی منبنوا دانیال ( ٣٥ ) ڕوویدا ، کە بە بزاڤی بندیکتنی ( ٣٦ ) چاکسازی ناسرا ، بە هۆی ئەمەشەوە زۆرێك لە پەرستگاکان بە فەرمانی ئیمپراتۆر داخران .

## ڕێنیسانسی وەرگێڕان لە جیهانی مەسیحیدا

لە گەڵ ئەوەشدا کە پێشتر بە شێوەیەکی کورت ئاماژەمان بە ڕێنیسانسی وەرگێڕان دا کە ئەوروپا بە خۆیەوە بینی ، بەڵام لێرەدا جارێکی تر ئەیخەینەوە بەرباس و لێکۆڵینەوە بە هۆی ئەو گرنگی یەی کە هەیەتی .

پێش جەنگەکانی خاچپەرستی پەیوەندیە بازرگانیەکانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا تەنها لە ڕێگای دەریای ناوەڕاستەوە کورت هەڵاتبوو ، ئەمەش لە میانەی شارە کەناریەکانی ئیتاڵیا ، بە تایبەتیش ڤێنیسیاو جنوەوە ئەنجام دەدرا . بازرگانە ئیتاڵیەکان کەلوپەلی گرانبەهاو جوانکاریان لە شارەکانی بیزانس و دیمەشق و بەغدادو میسرەوە بۆ خانەدانەکانی ئەوروپا (٣٧) ئەهێنا ، لە گەڵ کرینی ئاوریشم و بەهارات چەندین بەڵگەنامە و هێلکاری و دەستنووسیان بە زمانەکانی یۆنانی و عەرەبی و عیبری دەکڕی و بە نهێنی دەیانبردە ئەوروپا ، هەوادارانی فەلسەفەی مرۆیی کڕیاری باشی ئەو جۆرە کەلوپەلانە بوون ، و زانا مەسلمانەکانیش (٣٨) ڕۆڵی نێوەندیان لەو

مەسەلەیەدا دەگێڕا ، چونکە ئەوان سەرچاوە زانستی یە یۆنانی و ڕۆمانەکانیان کۆکردەوەو تەرجەمەیان کردن و لێکدانەوەی خۆشیان لە سەر نوسی ، ئینجا دواتر لە ڕێگای مەڵبەندە زانستی یەکانیان لە غەرناتە ، بۆ جارێکی تر بۆ خۆرئاوایان گواستەوە .

دیارە وەرگێڕانی بەڵگەنامەو سەرچاوە یۆنانی و ڕۆمانیەکانی بەغداو جندی شابور مەسیحیە خۆرهەلاتیەکان پیێ ی هەڵدەستان ، واتە ئەو ئەرسەدۆکسانەی کە کلێسای کاسۆلیکی ڕقی لێ یان دەبۆوە ، چونکە ئەوان باوەڕیان بە یەکبەنی بوونەوەر ( وحدة الوجود ) سەبارەت بە مەسیح هەبوو (٣٩) ( پیێ یان وابوو کە مەسیح (د.خ ) سیفەتی مرۆیی و سیفەتی خوایی هەیە ) ، وە هەروەها ئەو نەستووری و جوولەکانەی کە بە هۆی ستەمی حکومەتی بێزەنتی یەوە هەلاتن ، ڕوویان لە ناوچە موسڵمان نشینەکان کردو دەستی یان کرد بە کاری وەرگێڕان وە ئەو سێ کۆمەڵەیەی کە باسمان کردن لە توانایان دابوو بچنە نێو قوتابخانەو جێگاکانی وەرگێڕان و کتێبخانەکان و تەنانەت بارەگای خەلافەتیش . کەواتە ئەو کۆمەڵە ئاییینیانە ڕۆڵێکی مەزنیان بینی لەوەی کە بازرگانە ئەورووپیەکان بتوانن ئەو بەڵگەنامە زانستی یە گرنگانە بکڕن(٤٠).

ئەوەی کە یارمەتی ئەورووپیەکانی دا بۆ گواستنوەی ئەو بەڵگەنامەو سەرچاوە زانستیانە لە خۆرهەلاتەوە بۆ خۆرئاوا، بریتی بوو لە درێژی کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست کە مەسیحیەکان لەوێدا نیشتەجێ بوون. وەهەروەها بوونی چەندین مەڵبەندی دەسەلاتی سیاسی لە ئاسیای بچوك،

وەکو ئۆدێسا و حەران و نصیبین کە لەوێشدا مەسیحیەکان بڵاو ببوونەوە [٤١].

صەقلیەو غەرناتە لە گرنگترین کەناڵەکانی گواستنەوەی زانستە ئیسلامیەکان بوون بۆ ئەوروپا. سەرانی بزاڤی مرۆیی چەندین کەسیان لە مەسیحی و جولەکە و تەنانەت موسڵمانایش هەڵبژاردلەوانەی کە یۆنانی و رۆمانی و عەرەبی عیبری دەزان، تاکو بەکاریان بهێن بۆ کڕین–یاخود دزین–ی بەڵگەنامە و سەرچاوە زانستی و فەلسەفی و مێژوویی یەکان، وە دواتریش بە شێوەیەکی نهێنی لە ژێر پەردەی کەلوپەلی بازرگانی بۆ ئەوروپایان بگوازنەوە. ئەو کەسانەش زۆربەی جار بە پۆشاکی بازرگان و پیاوی ئایینی لە نێوان خۆرهەلآت و خۆرئاوادا گەشتیان دەکرد(٤٢).

ئەو دەست نووسە کڕدراو ودزراوانە دەدرانە دەست وەرگێرە یۆنانی و مەسیحی و جولەکە و موسڵمانەکان لە شاری (بالرم)ی مەڵبەندی صەقلیە، کە لەلایەن پاشا نۆرماندیەکانەوە فەرمانڕەوایی دەکرا، بەتایبەتیش لەسەردەمی فردریکی دووەمدا، کە قەشە ریمۆند (٤٣) لە ناوەڕاستەکانی سەدەی (١٢) دا سەرپەرشتی تەرجەمە کردنی ئەو دەقانەی لە زمانە رۆژهەلآتیەکانەوە بۆ لاتینی کرد.

لە ناودارترین زانا وەرگێڕەکانی ئەو کات، فرانسوا ئیبلارد[٤٤] بو کە ژمارەیەکی زۆری لە مەسیحی و جولەکە و موسڵمانەکانی ئەندلوس رێکخست، بە مەبەستی تەرجەمە کردنی دەقە زانستی و فەلسەفیەکان. وەرگێڕەکانیش هەریەکە و لەوانە تایبەتمەند بون بە تەرجەمە کردنی قورئانی پیرۆز. بەرپرسی ئەو کۆمەڵەیەش قەشە بیرۆندابل (٤٥) بوو کە خودی ئەویش بوو

مەسەلەی جەنگی لە دژی موسڵمانان خستەڕوو، بەلام ئەو جەنگە سەربازی نەبوو بەڵکو لە شێوەی غەزوێکی کلتوری سەرچاوە ئیسلامیەکان بوو(٤٦).

بە هۆی ئەمەوە ئەبیلارد یەکەم رووخساری دیاربوو لە ڕێنسانسی ڕۆشنگەری و بوژاندنەوەی ئەوروپادا، وە هەروەها هەر ئەویش یەکەم قەشە بوو کە هەڵسابە خوێندنی زانستەکانی غەیری کلێساو، دروشمی یەکبونی عەقل و ئیمای، کە دروشمی بزاڤی مرۆیی و ڕۆشنگەری بوو رایگەیاند.

دوای ئەبیلارد، ڕۆڵی ئلبێرتی گەورە (٤٧) دێت، کە لە شوێن کەوتووانی پەیڕەوی ئیبن سینا بوو، وە هەروەها قەشە تۆماس واکن کە بە ناودارترین فەیلەسوفە مەسیحیەکانە سەدەکانی ناوەڕاست دادەنرێت، وە قەشە ئەنسێلم (٤٨). قەشە ئەنسێلم بەڕێوەبەری قوتابخانەی چارتر لە سەدەی (١٢) بو وە یەکێك لە گەورەترین سەرانی بزاڤی مرۆیی ئینگلیزی بوو، باوەڕیشی بە میحوەریەتی مرۆڤ لە بووندا هەبوو(٤٩).

وە لە گرنگترین دەسکەوتەکانی بزاڤی مرۆڤایەتی بریتی بوو لە سەربەخۆ بوونی زانکۆکان و دەرچوونیان بوو لە ژێر هەژموونی مەڵبەندە هێزە سیاسی و ئایینی یەکان کە ئەوەش هەرایەکی گەورەی لە ئەوروپا نایەوە

زانکۆی پاریسیش کە بەیەکێك لە کۆنترین زانکۆکانی ئەوروپا دادەنرێت، لە ساڵی ١٢٠٠ز لەسەردەمی فلیب ئۆگۆست (٥٠) دامەزراوە لە پێناو بەدەست هێنانی سەربەخۆیی دا ئەوە بوو لە ساڵی ١٢٢٩ز بۆ یەکەم جار لە مێژووی بزاڤی زانکۆیی دا بە مانگرتنێك هەڵسا. کە ئەو مانگرتنەش بوە هۆی بە یەکدادانێکی خوێناوی لە نێوان قوتابیان و هێزە حکومیەکان تیایدا چەندین قوتابی کوژران. ئەو مانگرتنە بۆ ماوەی دوو ساڵ بەردەوام بوو کە لەو

ماوەیەدا هیچ وانەیەك نە خوێندرا تا پاشای فەرەنسا (لویسی نۆیەم) کە بە کەسێکی دیندار و چاك ناسرابوو، سەربەخۆیی و کردنەوەی زانکۆکەی لە ساڵی ١٢٣١ز ڕاگەیاند.

زانکۆی ئۆکسفۆردیش لە ساڵی ١٢١٤ز دا لە سەردەمی پاشا جۆن سانتر سەربەخۆیی بە دەست هێنا.

بەڵام سەبارەت بە دوەم هۆکاری دەرەکی ڕینیسانس و شارستانیەتی ئەورویا، ئەوە دەتوانین ئاماژە بە جەنگەکانی خاچ پەرستی بکەین. ئەو جەنگانەی کە خۆرهەڵات و خۆرئاوای توشی روو بەروبوونەوەیەکی خوێناوی کرد بۆ ماوەی دوو سەدەی تەواو (١٠٩٦-١٢٩٥ز)، کە ئەوەش خاڵێکی وەرچەرخان بوو لە پەیوەندیەکانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا [٥١]. ئەو جەنگانەش چەندین هۆکاری شاراوەی هەن، سەرەڕای ئەوەی کە لایەنی مەسیحی ڕەهەندێکی ئایینی پێدەدا.

لە نێوان ئەو هۆکارانەشدا، دوو هۆی سەرەکی پەیوەندی بە بابەتی توێژینەوەکەمانەوە هەیە، کە ئەوانیش: هۆکارە ئابوریەکان کە چینی بۆرژوازی بزوێنەری سەرەکی ئەو هۆیانە بوون، وە هۆکارە ئایینییەکان کە لە ئاکامی پوکانەوەی ناوەخۆی کلێسای کاسۆلیکی هاتە کایەوە. بۆیە کلێسا بە تەواوەتی لە پەیامە خواییەکەی دوورکەوتبۆوە و خۆی بە جوانکاری و شتە ڕازاوەکانی دونیا گرێ دابوو.

وەهەروەها دەرکەوتن و فراوانبوونی مەڵبەندەکانی هێز لە هەمبەر کلێسادا وای کرد کە باوەڕی شوێنکەوتووانی مەسیحی لاواز بێت و کایەکانی دەسەلاتیش بکەوێتە لەرزەوە، ئەوەش لەلایەك بووە مایەی لاوازبوونی

پەیوەندیە ئایینییەکانی نێوان خەڵك وە لە لایەکی ترەوە دەسەڵاتی پاپای بەسەر شوێنکەوتوانیەوە لاواز و بێ هێز کرد. وە کڵێساش لە هەوڵی ئەوەدا بووتاکو دەرفەتێك بدۆزێتەوە بۆ وەستان لە ڕووی ئەو سەنتەرە هێزە جیاوازانە، ئەوەش لە پێناو وگێڕانەوەی کۆمەڵگەی مەسیحی بۆ ڕێگای ڕاست– بە گوێرەی گومانی خۆی– و فەرمانڕەوایی کردنی شەریعەتی عیسا (د.خ). دیارە بۆ ئەو مەبەستەش جەنگەکانی خاچ پەرستی چاکترین میکانیزم بوون، ئەمە سەرەڕای هۆکاری ئابووری ، واتە زاڵ بون بەسەر زەویەکانی خۆرهەڵات تاوەکو ئەورووپا (کە ئەو کات پێویستی بە زەوی هەبوو) هەموو ئەو پێویستیانەی کە بە زەوی و زاری هەبوو پڕیان بکاتەوە، بەم شێوەیەش لەلایەك دەتوان روبەڕووی گرفتی زیاد بوونی دانیشتوان ببنەوە کە کۆمەڵەی ئەورووپای تووشی چەندین تەنگژەی ناوخۆیی و دواڕۆژێکی نادیار دەکرد،وە لەلایەکی ترەوەبە هۆی جەنگ و هەڵکوتانە سەر کەسانی تر تێنوێتی چینی ئۆرۆستکراتی ئەورووپی و خانەدانەکان دەشکا کە هێزێکی گەورە و مەزن لە هەمبەر کڵێسادا پێك دەهێنا [52].

شیکردنەوەکانی پاپا ڕاست بوون و، ئەو بەرنامانەی کە بۆی دانا بون زۆر وورد و دروست بوون، بەڵام دەرەنجامەکەی نە بۆ بەرژەوەندی مەسیحی و نە بۆ ئیسلامیش بوو، چونکە چاکسازی ئایینی کاسۆلیکەکانی لە کورسی دەسەڵات هێنایە خوارەوەو، ڕێنسانسیش بووە مایەی لێك جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت، یاخود بە گوزارشتێکی چاکتر، سیاسەتی بەسەر ئایین دا زاڵ کرد. وە لە جیهانی ئیسلامیشدا، ئەو پەرتەوازە بوونە سیاسی و مەزەبیە بووە مایەی زەمینەی لە بار بۆ هێرشی مەغۆڵەکان. وە دواتریش داگیرکەران

بێنە ناوچە ئیسلامیەکانەوە. وەهەروەها ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی خۆرهەلآت کە ڕۆڵێکی بەرچاوی بینی لەو جەنگانەدا چارەنوسی لەوانی تر باشتر نەبوو، کە بەدەستی تورکە عوسمانیەکان ڕوخێنرا. کەواتە، ئەوانەی سوودمەند بوون لە جەنگەکانی خاچ پەرستی ئەو کەسانە بوون کە لە پشت دیوارەکانی کلێسا هانی خەلکیان دەدا تا بجەنگن، بۆ ئەوەی خەلك وا لە ئایین بگات کە هۆی هەموو جەنگ و خوێن ڕشتنێکە، کە ئەوانەش سەرانی بزاڤی مرۆڤایەتی و ڕێنسانسی ڕۆشنگەری و بۆرژوازی و پاشاکان بوون، واتە هەموو ئەو دەستە و تاقمانەی کە یارمەتی دەربوون بۆ دروست بوونی ڕێنسانس و دامەزراندنی شارستانیەتی نوێ ی ئەوروپا. جەنگەکانی خاچ پەرستی چەندین ئاکامی لێکەوتەوە، کە ئێمە دەچینە سەر دووانیان، لەبەر پەیوەندیان بە باسەکەوە:

**ئاکامی یەکەم:** خاچ پەرستەکان زۆرێك لە بەلگەنامە و سەرچاوەی زانستی عەرەبیان لەگەڵ خۆیاندا بردەوە ئەوروپا، ئەمەش دوای ئەوەی کە نیشتەجێ بوون و فێری زمانی عەربی بوون، ئەو بەلگەنامەو سەرچاوانەش بەردی بناغەی پرۆسەی ڕێنسانس بوون.

**ئاکامی دووەم:** بە هۆی کاریگەری جەنگەکانی خاچ پەرستی ، چەندین بزاڤ و شۆڕش لە ئەوروپادا سەریان هەلدا، کە بوونە هۆی ئەوەی گۆڕانکاریەکی بەرفراوان لە ستراکتۆری کۆمەلگەی مەسیحی بۆ بەرژەوەندی ڕژێمی سەرمایەداری نوێ بێتە کایەوە، وە ئەو گۆڕانکاریانەش بە ڕێنسانس ناوبرا. بۆیە ئەو شۆڕشە زانستیەی کە کۆپەرنیکۆس[٥٤] پێی هەستا یاسا کۆنەکەی بەتلیمۆس کە لەبارەی گەردووناسیەوە بوو، هەلوشاندەوەوە ئەو شۆڕشە ئایینی یە یاخود بزاڤە چاکسازیە ئایینی یەی کە مارتن لۆسەر[٥٥]

پێی هەڵسا بووە مایەی لەناو چوونی یەکێتی کڵێسای کاسۆلیکی و، پرۆتستانتیش بووە مەزەبی سەرمایەداری کە ئایینی لە سیاسەت و تەنانەت لە ئەخلاقیش جیاکردەوە. وە سەبارەت بەو فیکرانەش کە میکافیللی(٥٦) دەری دەبڕین ئەوە بە تەواوی دەسەلاتی ئایینی لەناو بردو، سیاسەتی لە ئاین و ئەخلاق جوێ کردەوەو، وە هەروەها بەکارهێنانی توندوتیژی لە لایەن دەسەلاتدارانی فەرمانڕەواوە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان بە کارێکی شیاوی زانی. وە شۆڕشی چاپەمەنی کە گوتەنبەرگ پێ ی هەڵسا بووە مایەی ئاسان بوونی پرۆسەی گواستنەوە و بلاوکردنەوەی هزرەکان. وە ئاراسم (٥٧) هەڵسا بەدەرهێنانی فەلسەفە لە ژێر دەسەلاتی کلێسا و، مرۆڤی کردە میحوەرێك لە توێژینەوە فەلسەفیەکاندا. ئەوەی جێگای سەیرە کە ئەو هەموو شۆڕشە زانستی و فکری و سیاسیانە گشتیان لە سەدەی شازدەدا ڕوویاندا.

لە ئەنجامدا دەرکەوتنی شارستانیەتی خۆرئاوا ، بە هۆچی زیندووکردنەوەی ئەو بەڵگەنامەو دەقانەوە بوو کە نزیکەی سێ هەزار ساڵیان بە سەر دا تێپەڕیوە ( ئەگەر وا دابنێین کە دەوڵەتی یۆنان لە ساڵی ١٠٠٠ پ.ز دامەزراوە ) ، بێگومان ژیاری خۆرئاوا لە یۆنان لە دایك بووە ، لە کاتێك دا کە کلتوری یۆنانی لە خۆرهەلات ی ئیسلامیدا پارێزراوە و گەشەی سەندووە دواتریش بۆ ئەوروپا گوێزراوەتەوەو بۆتە بنچینەی ئەو گەشەسەندن و ڕێنیسانسەی کە هەر لە سەدەی شازدەمەوە بەرپابووە تاوەکو ئیمڕۆش .

شارستانیەتی خۆرئاوا لە ئەنجامی دەرکەوتنی کۆمەڵێك لە هزرو ئاینزا پەیدابووە کە شێوەو شکلی ڕۆژئاوای ( لە ڕووی چەندایەتی چۆنایەتیەوە ) لە گشت ڕەهەندەکانەوە گۆڕی ، بۆنموونە : فەلسەفەی مرۆڤایەتی ،

میکاڤیلیەت ، پرۆتستانیەت ، لیبڕالی ، نەتەوایەتی ، واقیعی ، سەرمایەداری و چەندین ئاینزای تر .

دۆزینەوەی کیشوەری ئەمریکا لە لایە ن کریستۆڤەر کۆلۆمبس بووە مایەی ئەوەی کە شارستانێتی خۆرئاوا پێ بنێتە قۆناغێکی نوێوەو ، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی پەیوەندیەکانی خۆرئاوا لە گەڵ خۆرهەلآت و فیکرەی ئیستیعمار پەیدابێت .

وەهەروەها لە سەدەی حەڤدەمدا بە هۆی بەرپابوونی چەندین شۆڕشی سیاسی بارودۆخی ئەوڕپا گۆڕانی بە خۆیەوە بینی ، بۆیە هۆلەندا بە یارمەتی بەریتانیاو بە هۆی بەرپاکردنی شۆڕشی ١٦٠٩ توانی خۆی لە ژێر دەسەلآتی ئیسپانیا ڕزگاربکات و ، ڕژێمێکی کۆماری دیموکراتی دابمەزرێنێت . هەروەها شۆڕشی بوژانەوەی- دیموکراتی کە لە ساڵی ١٦٤٠ز تاوەکو ١٦٨٨ لە ئینگلترا بەردەوام بوو ، توانی تیۆری دەسەلآتی سێبەری خوا لەناو ببات و ، تیۆری دەسەلآتی نەتەوایەتی لە شوێنی دابنێت ، وە ئەوەش بە یارمەتی هزرەکانی بڕیاری سیاسی ناوداری ئینگلیز ( جۆن لۆك )(٥٨ ) ەوە بوو . ئەو تیۆرە نوێیە ، پاشای لە پاڵپشت نراوی تواناى خوایی هێنایە خوارەوەو ، مافی چارەنووسی سیاسی بەخشیە خەڵك ، سەدەی حەڤدە بریتی بوو لە سەردەمی زانستی تیۆری نوێ بۆ کێشەکان . لە میانەی بە کارهێنانی شێوازی لۆژیکی فەیلەسوفی ئینگلیزی خوانسیسی بیکۆن پوچەڵکردنەوەی شێوازە کۆنەکانی ئەرەستۆ لە توێژینەوەی زانستی دا ڕاگەیاندو ، شێوازی زانستی ( بینین و تاقیکردنەوە ، پۆلینکردنی بەخشەرە زانستی یەکان ) بووە جێگرەوەی . وە لە بواری فەلسەفەو ماتماتیك دا ، فەیلەسوفی

فەڕەنسی دیکارت ( ٥٩ ) تیۆری گومانی خستە روو و ڕژێمێکی نویێ لە بارەی بیرکردنەوەی زانستی دانا . وە سەدەی حەڤدە بە سەدەی گالیلۆی ( ٦٠) ئیتالی دادەندرێت ، کە دەنگدانەوەو هەرایەکی گەورەی لە بارەی زانستی فەلەکناسی هێنایە ئاراوەو ئەمەش بووە مایەی تورەیی کلێسا . بەم شێوەیەش سەردەمی دەسەلاتی ئەرەستۆیی و مەزەبی قوتابخانەیی (٦١) بە کۆتاهات ، وەهەروەها سەدەی حەڤدەمیش بە زانای ئینگلیز ئیسحاق نیوتن (٦٢) دەستی پێکرد ، لە بوارەکانی فەلەکناسی و فیزیاو فەلسەفەدا چەندین تێری دانا بە شێوەیەك کە تیۆرەکانی لە بارەی فیزیاوە بۆ ماوەی دوو سەدە بە بێ ڕکابەر لە کۆڕو کۆمەڵە زانستی یەکاندا مایەوە .

وە هەروەها لەو ەسەدەیەشدا بۆ یەکەمین جار لە جیهاندا سەرکەوتنی بزاڤە ڕزگاریحوازەکان لە شۆڕشی ئەمریکا دژ بە ئیستیعمار تاقی کرایەوە . وە هەروەها دەرکەوتنی شۆڕشی پیشەسازی لە بەریتانیا ، هەر لە هەمان سەدە بووە مایەی گەشەسەندنێکی مەزن لە پیڕۆی ڕەنیۆ هانین دا . وە شۆڕشی فەڕەنسیس گۆڕانێکی ریشەیی یە بە سەر دەزگاکانی سەدەکانی ناوەڕاست داهێنا . وە ئەو گۆڕانەش بە تەنها کۆمەڵگەی ئەوروپی نەگرتەوە ، بەڵکو گشت کۆمەڵگاکانی جیهانی گرتەوە .

لە کۆتاییدا دەڵێین ئەو شارستانیەتەی کە ئێمە ئیمرۆ ئەیبینین، لە میانەی دوو رووداوی گرنگەوە دروست بووە: شۆڕشی پیشەسازی لە بەریتانیا و، شۆڕشی سیاسی لە فەرەنسا، وە سەدەی نۆزدەش بو میرات گری ئەو دوو رووداوە دادەنرێت، کە سەدەیەکە تەژی یە لە بارگرژی یە سیاسی و سەربازی یەکان.

سەرچاوە و پەراوێزەکان

1- Philippe Wolff
2- Toulouse
3- L. Eveil Intellectuel del Europe.
4- Carolingien.
5- Mesopoamite.

٦- هنری لوکاس، تأريخ الحضارة ، ترجمە: عبدالحنين.
أذرنگ، مجلدان، طهران، مؤسسە کیهان، ١٩٨٧، ص٨٥.

٧- راجع: بارنزويکر، تأريخ الفکر الاجتماعی، ترجمە:
يوسفيان مجيدی، طهران، دار الخوارزمی، ١٩٧٩م.

٨- مجموعە من الکتاب الروس، تاريخ العالم، ترجمە:
باقر مؤمنی و صادق الضاري، ص١٥٣.

٩- م. کاوە، المذاهب الفلسفيە فی اليونان القديمە،
طهران: بدون ناشر، ١٩٤٨م، ص٢٢ و ٢٣.

١٠- الکسندر کويرە، افلاطون، السياسە، ترجمە:
امير حسين جهانبگلو، طهران، دار الخوارزمی، ١٩٨١م، ص١٦.

١١- أرسطو، السياسە، ترجمە: حميد عنايت، طهران
دار الخوارزمی، ١٩٧٩م، ص١.

١٢- بگەڕێوە بۆ ووتارێکی نوسەر لە گۆڤاری ((معرفت)) بە ناونیشانی ((ڕێنسانسی وەرگێڕان لە جیهانی ئیسلامیدا)) هاوینی ١٩٩٣.

13- Philippe Wolff ،L. Eveil Intellectuel، Edition duseuide L Europe Paris, 1987, p. 103.

١٤- ذكرالله محمدی، نامەیەكی ماستەرە بە ناونیشانی ((ڕۆڵی فەلسەفەو زانستە ئیسلامیەكان لە ڕێنسانسی ئەوروپا)) كە بە راوێژی نوسەرە.

١٥- اولیری، انتقال العلوم الیونانیە الی العالم الاسلامیە، ترجمە: احمد آرام، گهران، جامعە گهران، ١٩٦٢م، ص٥.

١٦- السیدە زیغرید هونكە، پقافە الاسلام فی اوروبا، التسمیە العربیە للكتاب هكژا: ((شمس العرب تسگع علی الغرب))، ترجمە: ملاتچی رهبانی، گهران، دار نشر البقافە الاسلامیە، ١٩٨٢م، ص١٧١.

17- Robert Delort, Hes Goisades, Edition du Seuid, Paris, 1988, P.220.

18- CHARLMACNE.

19- ALCVIN ALQVIN.

20- Saint ANSELM

21- GERBERT.

22- Jeam, Scot. ERIGENA.

23- CHARTRE.

٢٤- وە لە فەلسەفەی ئیسلامیشدا تێبینی ئەمە دەكرێت كە لە لای هەندێك لە رەوتە فكرەكان زانست وەپێش ئیمان دەخرێت. هەروەك موعتەزیلەكان وای بۆ دەچن كە پێویستە ئەقل وەپێش ئیمان بخرێت. وە هەندێكی تریش ئیمان وە پێش ئەقل دەخەن، ئەشعەریەكان لە نێوان هەردوو بارەكەدا حالەتێكیان هەڵبژاردووە. بۆ ئەمە بگەرێوە:

هنری كوربون، تاريخ الفلسفه الإسلاميه، ترجمه: الدكتو اسد الله مبشری، گهران، دار امير كبير، ١٩٧٩.

25- ANDALOUSIA
26- Sevil
27- Toled
28- SARAGOUS

٢٩- دامبی یر، تاريخ العلم، ترجمه: عبدالحسين ئۆزرنگ، گهران: دار سمت، ١٩٩٢، ص٩٣.

٣٠- Secularism بەمانای عەلمانیەت یاخود بیروبۆچوونی دنیایی دێت، ئەمەش لە بەرامبەر وشەی Regularism واتە شوێنکەوتووانی پەرەوی ئایینی، یاخود بیروبۆچوونی قیامەتی دێت.

31- Loup de Ferrieres
32- Ciceron

٣٣- Renaissance Urbine بە شارستانی بوون و ژیان لە شار لە جیاتی بەسەر بردنی ژیانی لادێی ی و ژیانی سەدەکانی ناوەراست.

٣٤- بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە: برتراند رسل، تاريخ الفلسفه الغربيه، ترجمه: نجف دريا بندرى، گهران، دار پرواز، ١٩٨٦.

35- Louis de. Pieus
36- Saint Benoit. d' Aniane
37- Benedictin

٣٨- سەبارەت بە دامەزراندنی پەیوەندیە نوێیەکانی نێوان خۆرهەلآت و خۆرئاوا یاخو ئیسلام و مەسیحیەت، بگەڕێوە بۆ پێشەکی کتێبەکەی،

هوشنگ نهاوندی، تاریخ الافکار الاقتصادیە، ص٤، تهران، دار نشر مروارید، ١٩٧٥، (بەزمانی فارسی).

٣٩- زانایانی خۆرئاوا هەردوو واژەی جیهانی ئیسلامی و جیهانی عەرەبی وکو هاوتای یەکتر بەکار دێنن، لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی زۆریان لە نێواندا هەیە، چونکە جیهانی ئیسلامی گشتگیرترە لە جیهانی عەرەبی لەبەر ئەوەی هەموو ئەو موسڵمانانەش دەگرێتەوە کە بە زمانی نا عەرەبی قسە دەکەن.

٤٠- بگەڕێوە: لویس ولیام هنری هال، تاریخ و فلسفه العلم، ترجمه: عبدالحسین ژرنگ، طهران، دار نشر سروش، ١٩٨٤م.

٤١- أولیدی، مصدر سابق، الفصل الخامس وما بعده.

٤٢- تاریخ الفلسفه فی اوروبا، محمد علی فروغی، ص٤، طهران، نشر زوار، ١٩٨٧م، ص٨٣ (با الفارسیه).

43- Reymond
44- Abelard
45- Pierre . de venerable
46- Jacques le Golff .P20.
47- Albert Le Grand
48- Saint ANSALM

٤٩- بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە: بییر دوکاسه، الفلسفات الکبری، ترجمه: احمد یَرام، گهران، دار نشر پرواز، ١٩٨٨م.

50- Philippe August

٥١- رشاد محمد، الحروب العلبيه، مجلدان، گهران، نشر انديشه، ١٩٧٢م، ص٦٩.

٥٢- كارل بكر و فردريك دنكاف، ماچي الحچاره، ترجمه: محمد على زهما، كابل: منشورات جامعه كابل، ١٩٣٨، ص١٧٧ وما بعدها.

53- Nicolas Copernic

54- Martin Luther

٥٥- بۆ زانینی رەگ و ریشەکانی مەزەبی پرۆتستانتی بگەڕێوە بۆ کتێبی ((مارتن لوثر)) تألیف أمرسون فاسديك، ترجمه: فريدون بدرەای.

56- Nicolas Machiarel

57- Didier Arasme

58- John Locks

59- Rene Descarts

60- Galilo Galilei

٦١- بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ کتێبی: تاریخ العلم، تالیف: دامبی یر.

62- Isaaq Newton.

سەرچاوە:

مجلة التوحيد، آب ١ژ٩٩٥، العدد٧٧.

# نرخی شارستانیەتی رۆژئاوایی

**ئەم پەیجووە رۆژئاواییە لە بنەڕەتدا بە خوێن و قووتی گەلانی دیکە بنیات نراوە**

هاورێیەکی پێی گوت:

هێشتا لە یادمە کە نامەی دکتۆراکەم تاوتوێ دەکرا، چۆن گوێی دوو لە ئەندامانی لێژنەکە سوور هەڵگەڕاو بەوە رازی نەبوون کە هێرشی فەرەنگە خاچ دروشمەکان بۆسەر قودس و سەربڕینی حەفتا هەزار کەس لەوێ بەدەست درێژیی ناوزەد بکەم، گوتیان(ئەمە گوتەیەکی زانستی نییە).

گوتم: پێش ئەوەی وەڵام بدەمەوە، دەمەوێت پرسیار بکەم ئێوە لە کتێبە زانستیەکانتاندا بەڵکو لە کتێبەکانی قوتابخانەیش چ ناوێك لە وڵاتگیری هاتنی مەغۆل و سەرکردەکەیان بۆ ئەورووپا و کشانی جەرمانی بەسەر ئیمپراتۆریەتی رۆمانی دەنێن؟ بەڵکو هەندێ کات و لە کتێبی منداڵاندا لە هاتنی عەرەبەکان بۆ ئیسپانیا چ دەڵێن؟

لەو سەرچاوانەوە فێری ئەو وشەیە بووم، ئێوە لە رۆژئاوا ماوەیەکی درێژ لەسەر ئەوە راهاتبوون کە خۆتان بە تەنیا مێژوو بنووسنەوە و خەڵکانی دیکە بیخوێننەوە، ئیدی خەڵکیش لەلایەن خۆیانەوە مێژوو دەنووسنەوە، ئەمەش بە تێڕوانینی خۆیان دەبێت روویەك لە ئاوێنە بخوێننەوە کە لە پێشتردا نەتانبینیوەو خەڵکانی دیکەش ئەو ئاوێنەیە هەڵدەگرن، هەموو بۆگەنی رابردوو لە جیاتی گوڵەکان دەخرێتە سەبەتەکانتانەوە ئەمەش لە رۆژێکی نزیکدا دەبێت.

بە هاوڕێیەکەی گوت: وای دابنێین کە ئەوەی تۆ دەیڵێیت بە راستی راست بوو، بەڵام مێژوو لەلایەن بەهێزەکان و سەرکەوتووەکانەوە دەنووسرێتەوە، شارستانییەتی رۆژئاوایش لە داپۆشینی تەنانەت تاوانەکانیش بەردەوام دەبێت بەوەی کە بە مرۆڤی بەخشیوە لە رەهەندە فیکری و گەردوونییەکان.

هاوڕێیەکەی پێی گوت: بەڵام ئەو نرخەی کە بۆ گەیشتن بەو رەهەندە درا، ترسناک بوو، ئایا دەزانیت ئەو نرخە چەند گرانە؟ هەموو جیهانیش دای.. بێجگە لە خودی ئەورووپا!

رووەکەی دیکەی ئەم شارستانییەتە هێشتا نەنووسراوەتەوە.

رووەکەی دیکەی ئەم میدالیا ئەڵماسییە هێشتا ئاشکرا نەبووە، باق و بریقی کە ئازاری چاو دەدات، رێگای نەداوە خوێن لەبەر چوون و لاشەکان لە لایەکی دیکەوە ببینرێت.

به هاوڕێیەکەی گوت: ئێستا دڵنیا بووم کە (دونکیخۆت) ی جوانە مەرگ هێشتا نەوەی هەن کە شەڕ لەگەڵ ئاشی هەوادا دەکەن، تۆ دەتەوێت باشییەکانی ئەم شارستانیەتەو ئەوەی پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردووە، لە یاد بکەم؟ ئایا دەتوانیت چاوم بۆ رابردوو وهەڵەکانی رابردوو ئاراستە بکەیت و گەیشتنی مرۆڤ بۆ سەر مانگ نەبینم؟

هاوڕێیەکەی پێی گوت: من تەنیا ئەمویست ئەوە بڵێم کە ئەو راستەقینەیە روویەکی دیکەی تاریکی هەیە، وەکو رووەکەی دیکەی مانگ، و ئێمە پشکداری بنەڕەتین لە بنیاتکردنی ئەم شارستانییەتە رۆژئاواییە نەك تەنیا هەر لە رێگای کۆششەکانی ئێمەشەوە، پشکی ئێمەی تێدا لە دەمارەکانمانەوە دراوە، دەبێت ئەم راستەقینەیەش بە شێوەیەکی تەواو بزانین، لە دووبارەکردنەوەش

بێزارنەبین، هەروەها ببێتە ئەلف و با بۆ منداڵەکانیشمان، مێژووی ئەم شارستانییەتە لە خۆیدا مایەی بایەخپێدانی من نییە، بەڵکو ئەوەی مایەی بایەخپێدانی منە مێژووی لەگەڵماندا و مێژوومان لەگەڵیدایە، مێژووی ئەو پەیوەندییە دڕندانەییانە، کە لەگەڵ لاوازەکاندا بەستوویەتی، باسی ئەو پەیجووە و ئەو نرخەش بۆ دەکەم؟

قۆناغی بنبڕکردن:

ئەمەش داستانێکە بە سێ قۆناغ ئەنجام دراوە، هەر قۆناغێکیش کارەساتێکی مرۆڤایەتی بوو، یەکەم جار قۆناغی بنبڕکردنی بەکۆمەڵ و کۆیلەی رەش و فراوانبوونی عەزیابیانە هات، ئینجا قۆناغی تالآنکردنی جیهانی بوو، لە دواییشدا قۆناغی دوایی هات کە تییایدا دەژین: قۆناغی پەرەپێدانی دواکەوتوویی.

١- قۆناغی بنبڕکردن و کۆیلایەتی: داستانەکە لە سەرەتادا بەدوو ئامراز دەستی پێکرد کە ئەورووپای رۆژئاوا لە عەرەبانی وەرگرتبوو، بەوسەلەو باروت، بەوسەلە بووە بنەمای کەشتی مەزنی چەند چارۆکەیی و دەرگای بۆ هێزی دەریایی و چوونە جێگای دوورکردەوە، باروتیش بووە ئامرازی کوشتن لە دوورەوە، ئینجا کۆلۆمبۆس یاسایەکی کارکردنی دانا بۆ ئەو کەشتییانەی لە دەریای سوور ئەو کەشتییە رۆژئاواییانەی لە دوای ئەو هاتن، ئەویش بریتی بوو لە کشان بۆ رۆژئاوا بۆ دەورە دانی رۆژهەلآت و تالآن کردنی! رۆژهەلآت دەوڵەمەندی و زێڕو دێرینی و حەسوودی ئەویدی پێ براببوو! تاکو ئێستاش چوونە جێگای دوورو کوشتن لە دوورەوە تالآن کردنی ئەویدی ئامانجەکانی رۆژئاوای ئێستان: لەم پێناوەشدا سێ کیشوەر وێران کران، چوار سەدە ووردو

خاش کران، هەرچی یەکەمیان هەموو ئەو مرۆڤانە سڕانەوە کە لەسەر رووی بوون، ئەو هیندییە سوورانەی کە چەکەکانیان تیرو کەوان بوو ئەوە لەلایەن لەخواترسی خوێناوی خاوەن چاوی شین و پێستی سپی هەلگری تفەنگ بەدەستێك و کتێبی پیرۆز بەدەستەکەی دیکەیەوە دەسوتێنران. هەرچی کیشوەری دووەمە ئەوە هەمووی ئەو مرڤانەی لەسەر رووی بوون بە کۆیلە کران، ئەوانە تەنیا رەش پێستن! ئایا گیانیان هەیە؟ ئەوە جێگای گومانە، کەواتە ئەوان شایانی پتر لەوەنین کە ببن بەچەند کاروانێکی کۆیلەکان!! هەرچی کیشوەری سێ یەم ئەوە مرۆڤەکانی وەکو کرم زۆرن، وەکو کرم کەوتونەتە سەریەکتری بێجگە لە چەوساندنەوەو مردن بۆ هیچی دیکە دەست نادەن، با بۆ چەوساندنەوەو مردن بن!

بەم شێوە رۆژئاوا چل ملیۆن مرۆڤی لە یەکەمیان سەربڕی، سەد ملیۆن کەسیشی لە دووەمیان کرد بە کۆیلە، خوێنی پێنج سەد ملیۆنیشی لە سێیەمیان مژی.

لە کیشوەری یەکەمیان (ئەمریکا) ئەوروپییەکان بە دڕندەییانە دابەزین، هەموو چاوچنۆکی دنیا لە چاوانیان دابوو، دانیشتوانی رەسەن کە ئەوروپییەکان پێیان گوتن هیندییە سوورەکان واپێشوازییان لە ئەوروپییەکان کرد وەك بلێیت خودای سپین، بەلاّم هەر زوو زانیان ئەهریمەنی ئاگرو ئەژدیهای دڕندەی حەوت سەرن!

ئەمریکا پێش کۆلۆمبس دنیایەکی تەواو بوو لە شارستانیەتییەکان سیستەمی فەرمانڕەوایی و چینی کۆمەلاّیەتی و شاو سوپاو قەلاّو پەرژین و ڕێگاو کۆشکی دەرگا زێڕین و ئەو شارانەی چاو تووشی سەرسامی دەکەن، ئەو هونەرانەی لە

خەیاڵ سەرووترن لە وێنەکێشان و هەڵکۆڵیندا، نووسین و ژمێرەو ئەندازەو مەعاریفی فەلەکی وردو پزیشکی و چارەسەری، پیشەگەری و کشتوکاڵ کە دەچێتە سەربان و تۆڕی سەرسوڕهێنەر لە کەناڵەکانی ئاودێری، خشڵی ئەفسانەیی جوان و کانزاکاری زێڕو زیو مس و مێژوویەك لە پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان و لە شەڕەکان و ئیمپراتۆریەتییەکان و ڕێوڕەسمەکانی ئاهەنگ گێڕان و سرووتەکانی ئاین و کەهەنووت، ئەو هیندییەی کە فیلمەکانی کاوبۆی پێشکەشمان دەکات کە بەرەو ڕۆژئاوا دەکشێت چاوی سووری دڕندەیە دەموچاوی مسی پڕ قینە چەقۆی غەدر ڕەشماڵی بەرانەتی دەدڕێت، ئەو هیندییە درۆی ڕاگەیاندنی ئەمریکییە، ئەوە تەنیا لەلایە دوورەکانی ئەو شارستانییەتانە هەبوو، خاکی ئەمریکا لە باکوورەوە تاکو ئەوپەڕی باشوور دابەش ببووە سەر شارستانییەکانی ئەزتیکی خاوەن منارە خورافییەکان لە مەکسیك و مایا لە کۆلۆمبیاو تاینو لە دوورگەکانی ئەنتیل و شانشینی ئەلاتکا، خودای خۆرە زێڕینەکان، لە پیرۆو تۆبیتاما لە بەڕازیل و فوارانی لە پاراگوای و بەراوکانیین لە چیلی هەموو شارستانییەتییەکیش ڕێگایەکی هەبوو.

- **کاتێك کۆلۆمبس گەیشت:**

لەناکاو لەسەدەی شازدە کارەسات ڕوویدا ئەمەش دوای ئەوەی کۆلۆمبس سەری لێدا..ئەو شارستانییەتە هەمووی کوژایەوە، ئەمەش بە لێدانی ئەهریمەنی توندی یەك لە دوای ئەوی گرتەوە، بە خوێن و زێڕی خاوەنەکانی خنکێنران، شێتی زێڕ کە تووشی هێرشبەران بوو ڕەگەزی هیندی بە دڕندانە لە ناوبراو تەنانەت سێبەری ماڵەکانیشی گرتەوە..

کورتیر نادی کاساتا، بیسارو ئەزیفیدو، کاوفاخال ماردجیل ئەلأندرو (دوژمنی ڕەگەزی مرۆیی) وەکو حەزی دەکرد بەو ناوەبانگ بکرێت.

چەند ناوێك لە دۆزەخەوە، هەتاهەتایە لەگەڵ ناوی جەنگیزخان دەبن! کتێبی لەناوبردنی هیندییەکان کە ئێستا بە چیرۆکی ڕەش دەناسرێ(لاس کاسر)ی خاوەنی هەندێك لە توانە تۆقێنەرەکانیانی تێدا گێڕاوەتەوە بۆ زمانە جۆر بە جۆرەکان وەرگێڕاوە، بەلأم بەبێ زایەڵە.

ئەو هیندیيانەی مانەوەش سەر شۆڕبوون، زۆر لاواز بوون بەرامبەر بە بارووت، ئینجا هێرش بەرەکان نەخۆشی خۆریکەو نەخۆشییە زەهرییەکانیشیان لەگەڵ خۆیاندا هێنایە کیشوەری نوێ و هیندییەکانی بە هەزارەها دوورییەوە، داخی هەتاهەتای لە ڕووی نەوە پەرت و بڵاوەکانیان تاکو ئەمڕۆیش دیاری، لە دوای سەدەیەك و شتێك ئەوەندەی نەمابوو هیندی لە کشوەرە گەورەکەی بفەوتێ، ئەورووپیەکانیش زەوییان بەوەی سەر زەوییەوە بۆ مایەوە.

لە پێناو چەوساندنەوەی ئەو زەوییە، کیشوەری دووەم ئەفریقیا کەوتە کارەساتەوە، کەشتیکەلە ئەورووپییەکان دەسەڵاتیان بەسەر کەنارە ئەورووپییەکان پەیدا کرد و ڕاوە ڕەش پێستیان تێدادەکرد، ئەمەش بۆ ئەوەی بیان کەن بە ئامێری کێلأن و کانزاکاری و خزمەت کردن لە ئەمریکا، لەلایەن خۆشییەوە ئەو ئەفریقیایەی بەڕەش ناویان دەهێنا وڵاتی دەهۆڵی کوتراو لە دارستان و دەم و چاوی بۆیە کراوو گرژبوونی هێستریانەی دەوروبەری ڕمەکان نەبووە شەوی تێیدا وەکو ماری تینوو خۆی بابدات، ڕەش پێست دڕندەی بەرایی دارستان درۆیەکی دیکەی درۆیەکانی ڕۆژئاوا بوو.

